# فەرهەنگی لێکچواندن (تشبیه)

## لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقدا



کوردی - فارسی

ئیبراهیم ئەحمەدی

# فەرهەنگی لێکچواندن (تشبیه)

## لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقدا

کوردی ـ فارسی

ئیبراهیم ئەحمەدی

سرشناسه : احمدی، ابراهیم، ۱۳۳۳ -

عنوان و نام پدیدآور : مینا فەرهەنگی لیکچواندن (تشبیه ) لەپەندی پیشینان و قری نەستەقدا کوردی- فارسی/ ئبراهیم ئە حمەدی.

مشخصات نشر : سنندج: دانشگاه کردستان، ۱۳۸۷.

مشخصات ظاهری : ۱۰۰ ص.

شابک : ۹۷۸-۹۶۴-۸۶۲۰-۸۶-۳

فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : کتابنامه : ص [۹۵ ]-[۹۶ ].

موضوع : کردی -- واژەنامەها -- فارسی

شناسه افزوده : دانشگاه کردستان

رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶/۲۳آ۲۷۵۳الف ۱۳۸۷

رده بندی دیویی : ۴فا۹ک/۳

شماره کتابشناسی ملی : ۲۵۵۸۶۶۱


## ناسنامەی کتێب


ناوی کتێب : مینا فەرهەنگی لێکچواندن

نووسەر : ئیبراهیم ئەحمەدی

هەڵەگری و پێداچوونەوە : رەحیم لوقمانی

پیتچین : سومەییە تەیمووری (سوما)

بڵاو کەرەوە : ئاراس

ژمارەی چاپکراو : ۲۰۰۰ دانە

نورەی چاپ : یەکەم ۸۸

نرخ : ۲۰۰۰ تمەن

شابک : ۹۷۸-۹۶۴-۸۶۲۰-۸۶-۳

ISBN: 978-964-8620-86-3

ناوەندی بڵاوکردنەوەی سنە پاساژی عیزەتی،

پەخشی کتێبی ئیمام غەزالی

تەلەفون:۲۲۵۶۱۰۰ ـ ۰۸۷۱

# به ناوی خوای میری مەزن

گرینگایەتی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە فۆلکلۆر تا رادەیەکە کە سازمانی فەرهەنگی یۆنسکۆ لە چەندین بەیانییە و لەوانە لە بیست و پێنجەمین کۆنفرانسی نێونەتەوەیی خۆی لە نوامبر ١٩٨٩ زایینی ئاماژەی بە پاراستنی فەرهەنگی سوننەتی و فۆلکلۆری کردووە. فۆلکلۆری کوردی زۆر دەوڵەمەندە بەڵام بێجگە لە چەند رۆژهەڵاتناسێکی ماندوویی نەناس و ئەویندارێ فەرهەنگی کوردی و چەند کەسێکی دڵسۆز کارێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوە نەکراوە. سادیقی هیدایەت (١٣٧٩: ٢٤٠) دەڵێ ئەو کارانەی سەبارەت بە فۆلکلۆری ئێران کراوە لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ بولغارستان، قەفقازیان، هیندووستان زۆر کەم و نادیارە. بۆ وێنە لە سەرانسەری رۆمانی کوێرەدێیەکت بۆ پەیدا نابێ کە تەواوی گۆرانیەکانی کۆ نەکرابێتەوە و نۆتی مۆسیقای لەسەر دانەنرابێ؛ یان لە ئیرلەند "قورسایی ئەو کاغەزانەی شتی وایان لەسەر نووسیون و کۆیان کردوەتەوە گەیوەتە شەست خەروار".

هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەسەر فۆلکلۆر، پێشەکی پێویستی بە کۆکردنەوە هەیە. جا ئەو جار دەکرێ کاری پسپۆڕی لەسەر بکرێت. هەر یەك لەم بابەتانەی وەك تەشبیە، کینایە، پەندی پێشینیان، مەتەڵۆکێ، گۆرانی، لاواندنەوە و دەیان و سەدان شتی وا لە هەر ناوچەیەك دوای کۆکردنەوە، دەکرێ لەباری کۆمەڵناسی، رەوانناسی، زمانەوانی، مێژوویی و دەیان بابەتی دیکەوە کاری لەسەر بکرێ. تەنانەت لە دۆعا و

نـزای ژنـانی ناوچـەیەك لەوانەیـە پێشـینەی زۆر نەخۆشـی لـە رابـردوودا لـە بـاری پزیشکیەوە ببینرێتەوە. بۆ وێنە ژنانی سابلاخی لە دۆعا و نزایان زۆر جار دەڵێن ئای جەرگت خرابێ. دۆستێکی پزیشك، کاتێ ئەم بابەتەم بۆ باس کرد کوتی لە رابـردوودا نەخۆشی "سپڵ" (طحال) لەو شارەدا زۆر بووە و ئەو زەمانە بەهۆی نەبوونی زانـینی تکنیکی لەم بارەوە زۆرێك لە نەخۆشەکان تێدا ئەچوون. ئـەمن پـێم وایـە تەنانـەت کۆکردنەوەی نێوی کوردی نەخۆشینەکان دەتوانێ پزیشکەکان یارمەتی بدا تـا چـاکتر بتوانن نەخۆشینی نەخۆشە بێسەوادەکان، بە تایبەت پیرەکان چارەسەر بکەن.

جا با ئەو جار بینەوە سەر تەشـبیە و کتێبەکـەی کـاك ئیـبراهیم ئەحمـەدی. زۆر کەس پێیان وایە، وێنەگەلی خەیاڵ، تەنیا لـە زمـانی ئەدەبدان بـەڵام ئەمـە هەڵەیـە چـونکە زمـانی خـەڵکی ئاسـاییش پـڕە لـە وێنەگـەلی خـەیاڵ، مـەجاز، تەشـبیە، ئیستیعارە و کینایە. چاکترین بەڵگە دوو کتێبی بەڕێز کاك ئیـبراهیم ئەحمەدییـە کـە یەکەمیان سەبارەت بە کینایە و دووهەمیان سەبارەت بـە تەشـبیە و سـەدان و بگـرە هەزاران نموونەی تێدایـە. هێشـتا بـە بـڕوای مـن مسـتێکە لـە خـەروارێك کـە وایـە وێنەگەلی خەیاڵ تایبەتی زمانی ئەدەبییە. بەڵام جیاوازی شـێوازی زمـانی ئـەدەب و زمانی سەرەکی لەمەدایە کە لە زمـانی ئەدەبـدا وێنـەی تـازە دەخولقێنـدرێ کـە لـە پێشدا باو نەبووە.

تەشبیە بە بڕوای من بەرهـەمی "تـداعی معـانی" (Association of ides)یـە. مرۆڤ شتێکی دیوە خاڵێکی سەرنجڕاکێشی تێدا بەدی کـردووە، هـەر بۆیـەش کـاتێ شتێکی دیکەی دیـوە کـە وەك پێشـووەکە چـووە، ئـەوی وەبـیر هاتووەتـەوە. زمـانی کـوردی لـەم بابەتـەوە زۆر دەوڵەمەنـدە. بـەڵام مـەخابن لاوانـی پێگەیشـتووی ناتێکەیشتوومان لەبەر کۆپی کردنی بابەتگەلی ئەدەبی بێگانە و قسـەی زلـی پـڕ و پووچ و بێ نـاوەڕۆك سـەریان ناپـەرژێ ئاوڕێـك لـەو گەنجینـە پڕبایەخـەی فۆلکلـۆری کـوردی بدەنـەوە. بەداخـەوە کـورد هێشـتا فێـری نووسـین نـەبووە. رووداوی رۆژانـە،

بەسەرهات، کۆکردنـەوەی قسـەی خۆشـی پیـاوانی قسەخۆشـی رابـردوو، حەکایـەت، مەتەڵۆك، تەنانەت قسەی قۆڕیش هەر خۆی گەنجێکی گەورەیە. وشە کۆنـەکان، داب و نەریتەکان و دەیان و سەدان شتی دیکەی وا پێویستی بە کۆکردنەوە هەیە.

لاوی ئێستا کوا دەزانی "ئەستی و پوشوو" چی بووە و بۆچی بەکار هێنراوە. یان لە سەدان و بگرە هەزاران ساڵ لەمەوبەر نەخۆشینەکان چۆن چارەسەر کـراون، خـەڵك چۆن ژیاون و هەزاران پرسیاری دیکەی وا. جا بۆیە دەبێ قەدری رێزدار کاك ئیـبراهیم ئەحمەدی و کەسانی دیکەی وەك ئەو بزانرێت کە ماندوویی نەناسانە وەك سـەربازێکی ون قۆڵیـان لـێ هـەڵماڵیوە و خزمـەتێکی زۆر گرینگیـان دەس پێکـردووە. وەبـاڵ وەئەستۆم سەد وردکە خۆ بە رۆشنبیرزانی "پۆستمۆدێرنیان" بە قوربان بێت.

بەرێز کاك ئیبراهیم ئەحمەدی زۆر ئازایانە و مانـدوویی نەناسـانە تـا ئێسـتا دوو کتێبی بەنرخی پێشکەش کردووە. قەتیش لای وا نەبووە کە لەمە کاری چاکتر ناکرێ. یان ئەم کارانە بێ عەیب و ئیرادن بۆیەش هەر رەخنەیـەکی پسـپۆڕانە بـە دڵ و گیـان وەردەگرێ سەبارەت بەم کتێبەی کـە دەربـارەی (تەشـبیە)ە، بـۆ خـۆی پێشـەکییەکی پوخت و پاراوی لەسەر نووسیوە کە دەتـوانی کـەڵکێکی زۆری بـۆ خوێنـەران هـەبێ. بۆیەش بە بڕوای من پێویست ناکا کەسێکی دیکـە شـتێکی لەسـەر بنووسـێ، بـەڵام وەبیرهێنانەوەی دوو شت بە گرینگ دەزانم. یەکـەم ئـەو بابەتـەی کـە کـاك ئیـبراهیم ئەحمەدی لـە بەشـی یەکـەمدا سـەبارەت بـە تەشـبیە (لێکچـواندن) نووسـیویە زۆرتـر سەبارەت بە لێکچـواندنی (تەشـبیهی)یـە لـە زمـانی ئەدەبیدایـە. بەشـی دووهـەمی بەرهەمەکەی زمانی خـەڵکی سـەرەکییە نـەك زمـانی ئـەدەبی دووهـەم تاقمێـك لـە تەشبیهەکانی سەر زمـانی خـەڵکی ئـامرازی لێکچـواندن (ادات تشـبیە) و لێچـوون (وجە شبە)یان نییە کە بەداخەوە کەمتر سەرنجی ئەمانەی داوە جـاری واشـە کـێش و قافیەیان هەیە. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەمانە پاشماوەی شـیعری بڕگـەیی پـێش ئیسـلامی ئێرانن کە هەر ماونەتەوە بۆ وێنە سەرنجی ئەم تەشبیهەی خوارەوە بدەن "شێخە دێیە

کیّ بە کیّیە". ئەم تەشبیهە لە دوو رستە پیّك هاتووە، کە هەر کامیـان چـوار برِگـە (هجا)یە و هەر کامیشیان لە رستەکان، قافیەیان هەیە.

پیّشینیان دەلّیّن قسە هەزارەیەکی بەکارە، جا بۆیەش بە ئاواتی لەش ساغی بـۆ کاك ئیبراهیم ئەحمەدی لە پیّناوی دریّژەدان بەم تیّکۆشانە، کۆتایی بە قسەکانم دیّنم.

خوای گەورە هەموومان سەرکەوتوو بکات.

**دوکتۆر سەید ئەحمەد پارسا**

**مامۆستای ئەدەبی فارسی زانکۆی کوردستان**

# به ناوی خوای دلۆڤان

## شێوەی کۆکردنەوە و دارشتنی ئەم فەرهەنگە:

تا ئێستا کارێکی ئەوتۆ لە باسی لێکچواندن لە زمانی کوردی و فەرهەنگ نووسینی کوردیدا نەکراوە و لێکۆڵینەوەی لێکچواندنی (تشبیهی)یە لە زمانی کوردیدا باسێکی نوێیە و ئەگەر باسی لێکچواندن (تشبیه) لە برێك کتێبدا هاتووە، زۆر کورتە و بەرچاو نییە و بە شێوەیەکی سەربەخۆ کاری لە سەر نەکراوە. بۆ یەکەمین جار کە کینایەکانم کۆ دەکردەوە*، دەستم کرد بە نووسینەوەی لێکچواندنەکان لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقدا. حەیفم لێ هات کە کۆیان نەکەمەوە و فەرهەنگیان بۆ دانەنێم. ئەمجار ئیزنم دا بە خۆم کە هەنگاوێك هەڵگرم و لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بکەم. ئیتر تا چ رادەیەك توانیبێتم سەرکەوتوو بم، زانایان و شارەزایانی ئەم بوارە دەزانن. دڵم بەوە خۆشە رچەیەکم شکاندووە تا کەسانیتر دوای من بێن و ئەم رێگا پان و بەرین بکەنەوە. هیوادارم کە شارەزا و رووناکبیران بە تێبینی تایبەتی خۆیان سەرنجم بۆ لای کەموکورتییەکانی ئەم بەرهەمە رابکێشن.

دەبێ بوترێ زۆربەی لێکچواندنەکان سەر بە دیالێکتی سۆرانی زاراوەی ئەردەڵانین و واتاکانیان بە کوردی سۆرانی نووسراوەتەوە. سەرەتا دەستم کرد بە پشکنینی ئەو

---

* بڕوانە بۆ فەرهەنگی «کینایە» نووسراوەی ئەحمەدی.

کتێبانەی کە سەبارەت بە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقی کوردی نووسرابوون. لێکچواندنەکانم دەرهێنا و ئەوانەی شەرحەکەیان فارسی بوون وەرمگێڕایەوە سەر زمانی کوردی و ئەوانەش کە شەرحەکەیان کوردی بوون وەرمگێڕایەوە سەر زمانی فارسی و لە پاڵ هەر لێکچوانێك ئاماژەم بە سەرچاوەکەیشی کردووە. هەروەها لێکچواندنەکان لە سەرچاوەکەدا چۆن نووسراون دەقاودەق نووسیومەتەوە. جاری واش بووە لێکچواندنەکان لە دووسەرچاوەدا هاتوون و هەر کامیان بە جۆرێك لێکی داوەتەوە لەم شوێنانە هەردوولێکدانەوەکەم هێناوە.

ئەو شەرحەی کە لە نێوان چفتە یان قولاب دایە چ کوردی یان فارسی هی خۆمە و ئەوەیشی لە قولابدا نییە هی خاوەنەکەیەتی. لەگەڵ ئەوەدا کە دەمتوانی بەشی زۆری واتاکان لێك بدەمەوە حەزم کردووە هی سەرچاوەکان بنووسم و ڕێزی خاوەنەکەیم داناوە و ئەگەر خاوەنەکەی لە یەك یان دوو یان زیاتر ڕوونکردنەوە و شەرحی نووسیوە، دوای ئاخرین شەرح سەرچاوەکەیم هێناوە. ئەو لێکچواندنانە کە بە شێوەی سەرزارەکی لە خەڵکەوە گیراون سەرچاوەم بۆ نەنووسیوە. لێکچواندنەکان لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی و شوێنە جۆربەجۆرەکانی کوردەواری بڕێ جار واتاگەلێکی جۆراجۆریان هەیە بەڵام واتای زۆرینەی لێکچواندنەکان لە هەموو شوێنەکان وەکوو یەکە.

هەندێ لەوانە بەهۆی ئەوەی کە بە چەن شێوە لە لایەن خەڵکەوە بەکار هێنراون و جێ وشەکانیان جێ بە جێگە کراون، لەم فەرهەنگەدا دووپات و بگرە سێ پاتیش بوونەتەوە. ئەمە کارێکی ئاساییە و هەرکەس دەتوانێ بە پێی شێوە و بەکارهێنانی خۆی لێکچواندنەکە لە نێو ئەم فەرهەنگەدا بدۆزێتەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم تەنیا مەبەستم لەم کارەش ڕاژەکردنی زمانی کوردییە. پێشەکی کارەکەم کردووە بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی لێکچواندن (تشبیه).

**بەشی دووهەم:** لێکچواندن (تشبیه) لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقی کوردیدا.

## سپاس‌نامە:

سپاس و رێزم هەیە بۆ هاوڕێم شاعیر و نووسەر کاك رەحیم لوقمانی کە ئەرکی هەڵەگری پسپۆڕانەی کارەکەی بە ئەستۆ گرت و هەروەها سپاس بۆ دوکتۆر سەید ئەحمەد پارسا، عەدنان بەرزنجی، و هەروەها سپاس بۆ برای دڵسۆز و هێژام مەنسوور رەحمانی و رێز و سپاس بۆ خوشکی بەڕێزم سومەییە تەیمووری کە کاری پیتچنین و رازاندنەوەی لاپەڕەکانی بە ئەستۆ گرت و زەحمەتی زۆری کێشا.

**ئیبراهیم ئەحمەدی**

**زستانی ١٣٨٧ سنە**

*گوڵ چون رووی ئازیز نزاکەت پۆشان*

*بە فراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان*

(مەولەوی)

## پێشەکی:

**لێکچواندن (تشبیه Simile)**: بەشێکە لە رەوانبێژی و بەشێکی گرینگی جیهانی جوانکاریی زمانەو یەکەمین و ساکارترین رێگای دەربڕینی جوانی مانایە کە لە پەخشان و شیعر و تەنانەت قسەی باوی ناوخەڵکدا کەڵکی لێ وەردەگیرێ. لە لێکچواندندا وشە لە مانای راستەقینەی خۆیدا بەکار دێ. زۆرتر مەبەست لە لێکچواندن زیادەڕەوی لە ستایش یان لۆمە و یان بەیان کردنی چۆنیەتی و راستی شتێکی نەناسراوە بە چواندنی بە شتێکی ئاشکاراتر و ناسراوتر. هۆی سەرەکی لێکچواندن زیادەڕەوی (مبالغە) و خەیاڵاویبوونە. شاعیر بە بۆنەی هۆگری یان بێزاری سەبارەت بە مرۆڤ یان ئەو شتانەی کە لە زەینی دایە هەوڵ ئەدات ئەوانە بەرزتر یا نزمتر لەوەی کە هەن پیشان بدات. شاعیر لە ئەم شیعرەدا: کوڵمی دڵدارەکەی بە گوڵ، گەردنی بە شووشەی گوڵاو و روومەتی بە ماهی سنەوبەر قامەت و خۆر ئەشوبهێنێ. وەك:

وەختێ ئارەق دەرێـــــژن بـــــۆ كـــوشتنی (وەفایی)

بە گوڵی كوڵمت سوێند دەخۆم گەردن شووشەی گوڵاوە

ئەمن تەشبیهی روخسارت بە میهر و مەه بكەم حاشا

كــە تۆ ماهی سنـــــەوبەرقامەتی، خورشید روخساری

**(وەفایی)**

دیسان شاعیر، ددانی دڵدارەكەی بە مـرواری، كـوڵمی گەشـی بـە ئـاگر و پرچـی ڕەشی بە مار ئەشوبهێنێ.

ددان مــرواریییە و هەر یەك لەوانە　　　لە نرخـا گــەنجی قــاروون ناتەوانە

**(هەژار)**

لە چەشنی ئاگرن كوڵمی گەشی تۆ　　　لە مار حەستەمترن پرچی ڕەشی تۆ

**(هەژار)**

شاعیر بە زمانی شـیعر دەیـەوێ یەكسـانی لـە نێـوان لەشـی دڵدارەكـەی و ئـەو شتانەدا بدۆزێتەوە كە ئاماژەی پێ كردوون. لە ڕاسـتیدا زیـادەڕەوی ئـەكا و ئەیـەوێ لەشی دڵداری جوانتر لەوەی كە هەیە، پیشان بدات.

## لێكچواندن چوار بنەڕەت (پایە)ی هەیە:

١. لێچوو (مشبە)　　　٢. لەوچوو (مشبـەبە)

٣. لێچوون (وجە شبە)　　　٤. ئامرازی لێكچواندن (ادات تشبیە)

الف) لێچوو: بە شتێك دەشوبهێنرێ.

ب) لەوچوو: شتێكە كە لێچووی پێ شوبهێنراوە.

ج) لێچوون: حاڵەت و سیفەت و مانایەكە كە لەودا لێچوو و لەوچوو هاوبەشن بەڵام لە لەوچوودا دەبێ زیاتر و بەتینتر بێ.

د) ئـامرازی لێکچـواندن (ادات تشـبیه): لـه دیالێکتـهکانی زمـانی کوردیـدا ئهمانهن:

١. کوردی ناوهڕاست (سۆرانی) وهك: (چون، وهکوو، وهك، ئهڵێی، دهڵێی، بـووه، وهسه، چـما، ئێـژی، ئهیژیتـه، تـهرز، چهشـن، ئاسـا، وێنـه، لـه، کفـت، کوتومـت، هەروهك، میسلی، میسالی، رهنگ، به چهشـنی، لێبـووه، ئهکـهم، ئهبێتـه، دهبینـه، بووبوو، عهینهن، دهتگوت، به مهسهل، ئهچێ). بڕوانه بۆ دهقهکه.

کفت: کفت فلانی دهس خاڵی گهڕایهوه.

کوتومت: کوتومت براکهیه.

هەروهك: ئهگهر بێت و بنووسم، شهرحی هیجرانم له سهر کاغهز

ئهسووتێنێ ههناسهی حهسرهتم، ههروهك شهرهر کاغز.

(خادم)

بووبوو: ئهمشهو خهونم پێتهوه دی له خهوما بـووبـووی به پهری

(فهرهیدوون عهبدول)

میسلی: له دڵدا ئاتهشی عیشقت بڵێسهی میسلی تهندووره.

میسالی: موناسهبهی ئهو و لـــهیلا، میسالی دێو و پهری.

(حاجی قادری کۆیی)

رهنگ: پاشای بابان جیـهانگیری رهنگ رۆستـهمی زاڵی پیری

به چهشنی: دڵم به چهشنی ئاوێنه سپی و روونـاك و خاوێنه

(کاکهی فهلاح)

لێبووه: وای لێهات جێگاکهی خۆی لێبووه جههەننهم و دڵی بهروهستی نهدا، که چیدیکه کاتی لێ بهسهر بهرێت...

(عهزیزی مهلای رهش)

ئهکهم: هۆنراوه و چهپکی خهمم ئهکهمه گوڵ بۆ کچی...

(ئهنوهر قادر محهممهد)

ئەبێتە: کە شەو دادێ ئاسمانی شین پێدەکەنێ لە باوەشیا مانگ ئەبێتە گۆرانیبێژ...

**(ئەنوەر قادر محەممەد)**

دەبینە: ئێمەش دەمرین، دەبینە خاکی سەر رێ ئەو رۆژ، شەوە تەنووری سوبحی دەگەڕێ

**(حاجی قادری کۆیی)**

عەینەن: ... ئەو بەرگەی لەبەر بووکییان کرد، لەبەر چاوی خۆی عەینەن کفن بوو، کە سواریان کرد وەیزانی بەرەو قەبرستانییێ دەبەن.

دەتگوت: ... بەڵام چ ماینەکوێت، دەتگوت حەیاتە...

بە مەسەل: خاکی بەری پێت گەر بدەنە دەستی سولەیمان

ئەیکاتە دوو دیدە بە مەسەل سورمەیی جەوهەر

ئەچێ: ئەحواڵی ئەم زەمانە لە کایەی منالْ ئەچێ

دنیایەکی چ پووچەڵە کە لە زەرفی بەتالْ ئەچێ

٢. کوردی باکوور (کرمانجی شمال) وەك: (مینا، بینا، دەبێژی، دەیژی، شبێ).
مینا گوڵێ سوورە، دەبێژی ئاو زلالە، دەیژی ژەهری مارە، بینا بەرخێکە، شبێ بلْبلْەن دەخۆنە.

٣. کوردی باشوور (جنوب) وەك:* (منێ، منێك، منێدە، منێتە، جوور، چمانی، چو).

٤. گۆران وەك: هەورامی (پاسەنە، پێسەنە، ماچی، ئەجۆ، پێەسەو، پسەو، پووسە).

پاسەن: بێ بەدەڵەن عومر خاسش هەر پاسەن

باختەش پێ مەعشووق بێ بەدەڵ خاسەن

**(مەولەوی)**

---

* بڕوانە بۆ لاپەڕەکانی ٧١، ٧٣ و ٧٤ ئەم کتێبە.

چمان: چمان دڵ جمـــان چەنیـــت پەی سەفەر

زامـــــارن، کەفتـــەن پاوەپـــاییش کەر

(مەولەوی)

ئەجۆ: ئـــەمر و ماڵەکـــەم گجیە زەردەنـە

ئـــەجۆ مانـــگەنە و ئیـــنا پەردەنـــە

(میسباح)

ماچی: ماچی وەروەنە.

## چۆنایەتی هاتنی چوار پایەی لێکچواندن لە ڕستەدا:

هەرچەندە مەرج نییە کە چوار پایە لە رستەیەکدا بن بەڵام نابێ خاڵی بێ لە هەموویان وە یا لە هەندێکیان، وەکوو ئەم هۆنراوە کە هەر چوار پایەکەی تێدایە:

دڵـــم تەنـــگە وەکـــوو خونچـــەی دەمی تۆ

ســـەرم گێـــژە لە گێـــژی پەرچـــەمی تۆ

(هەژار)

«دڵتەنگی» لێچوو، «خونچەی دەمی تۆ» لەوچوو، «تەنگ» لێچوون، «وەکوو» ادات تشبیە.

دیسان هەر چوار پایەکەی تێدایە وەکوو ئەم هۆنراوەی «کوردی» کە ئەڵێی:

دی بە تاو ئەشکی دوو چاوم هەروەکوو دجلە و فورات

مەزرەعـەی غەم ســـەوز و تێراوە لەبەر ئەم دوو شتە!

«دجلە و فورات» لەوچوو، «ئەشکی دوو چاو» لێچوو، «تاو» لێچوونە، «وەکوو» ئامرازی لێکچواندن.

ئەم هۆنراوە سێ پایەی تێدایە جگە لە (ئامرازی لێکچواندن).

عاشقی بێ دڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هەیە

بێ شکە هەورەتریشقە تاوی بارانی هەیە

**(نالی)**

«هەورەتریشقە» لەوچوو، «گریان» لێچوو «دەناڵێ» لێچوون یان هەر لێچوو و لەوچوونی تێدا هەبێ دیسان هەر وەکوو «نالی» ئەڵێ:

سەهمی نگەهت خستمی هەستامەوە رامکرد

ئەگریجە و زولفت بە جەفا هاتنە یاری

**(نالی)**

«نگەهت» لەوچوو، «سەهم» لێچووە.

یان سێ پایەی تێدا هەبێ جگە لە «لێچوون» وەکوو ئەم هۆنراوەی «ئەحمەد موختار» کە ئەڵێ:

هیلالی یەکشەوەم دی سەجدە بەر بووم بێ تەئەممول من

موبارەك بوو لە لام چونکە ئەڵێی تاقی برۆی یارە!

«برۆی یار» لەوچوو، «هیلال» لێچوو، «ئەڵێی» ئامرازی لێکچواندن.

یا هەر ئەو ئەڵێ:

بە خوا شیشەی دڵم دایم لەبارەی عەشقی تۆ کەیلە

لە داخی سەروی باڵات ئەشکی چاوم هەروەکوو سەیلە

«سەیل» لەوچوو، «ئەشکی چاو» لێچوو، «وەکوو» ئامرازی لێکچواندن.

## دابەش کردنی دوو لایەی (تشبیه) بە هەست (حسی) و زەینی:

١. لێکچواندنی هەستی:

مەبەست لە لێکچواندنی هەستی ئەوەیە کە هەر دوو وشە لێچوو و لەوچوو بەر

یەکێ لە پێنج هەستەکانی مرۆڤ بکەون، وەك:(بینین، بیستن، بۆنکردن، تامکردن، بەدەستگرتن) بۆ وێنە:

دان و بەخشینیان لــە لا باوە　　　　خوونی مەیدانیان لە لا ئاوە

(حاجی قادری کۆیی)

لە نیوەدێڕی دووەمدا: «خوونی مەیدان» لێچووە و «ئاو» لەوچووە.

هەردووکیان، دەبینرێن، تامیان هەیە و، بەردەستیش دەکەون کەواش بێت لێکچواندنەکە لێکچواندنی هەستییە.

عەتری گوڵی بەهاری و رەنگی گوڵی ئاتەشی

لێچوو　لەوچوو　لێچوو　لەوچوو

لەم سەرسەرایەدا بە میسلی عوود و مەجمەرە

(کوکەای)

٢. لێکچواندنی زەینی:

ئەو لێکچواندنەیە کە وشە لێچوو و لەوچووەکانی بەر هیچ یەکێك لە پێنج هەستەکان نەکەون، بە تەنیا زەین هەستی پێ بکات. بۆ وێنە:

رەحم و ویژدان و مرووەت و نە وەك شکڵی پەری

تەمەع و غەدر و جەفا، زۆرە وەکوو لافاوە...

(فانی)

لە نیوەدێڕی یەکەم «رەحم و ویژدان و مرووەت» لێچووە، «شکڵی پەری» لەوچووە. هەمووشیان وشەی زەینن، چونکە بەر هیچ یەکێ لە پێنج هەستەکان ناکەون، ئەوە نەبێت زەین پەیان پێ دەبات، بۆیە لێرەدا لێکچواندنی زەینی بەرجەستە دەبێت.

عیلم و حیکــمت وەك حــــەیاتە پاسداری لێ بکەن

زەینی　ئامراز　زەینی

مەزرەعەی قەلبــت بە زانــین شەتــــڵی فەننی لێ بدە

٣. لێکچواندنی هەستی زەینی:

ئەو لێکچواندنەیە کە مشبە (لێچوو) هەستی بێ و مشبەبە (لەوچوو) زەینی بێ: بۆ وێنە:

ئەم ئاسمانە شینە کە وا بەرگی ماتەمە

تەحلیلی وا کراوە کە قوببەی غەمە، تەمە...

**(پیرەمێرد)**

لە نیوەدێڕی یەکەمی ئەم دێڕە هۆنراوەیەدا: «ئاسمانی شین» لێچووە، وشەیەکی لێکدراوی هەستییە، چونکە بەرهەستی بینین دەکەوێت. لە نیوەدێڕی دووەمیش «قوببەی خەم» لەوچووە، وشەیەکی لێکدراوی زەینییە، چونکە بەر هیچ یەکێکی پێنج هەستەکان ناکەوێت.

ئەتۆ بۆ بووی بە عەنقاوە دەمێ خونچەی دەمت بێنە

لێچوو لەوچوو

گەهێ کولمت گەهی سینەت دەمێ سەروی قەدت بێنە

٤. لێکچواندنی زەینی هەستی:

لێچوو زەینی بێ و لەوچوو هەستی بێت. بۆ وێنە:

ئاگری عیشقت لە دلما هەلکرا هەروەك سیراج

حالی خۆم ناگۆڕمەوە، ئەمڕۆ بە شاهی و تەخت و تاج

**(خادم)**

لە نیوەدێڕی یەکەمدا: «ئاگری عیشقت» لێچووە، وشەیەکی زەینییە، چونکە بەر یەکێ لە هەستەکان ناکەوێت. «سیراج» لەوچووە، وشەیەکی هەستییە، چونکە بەر هەستەکانی دەست و چاو دەکەوێت.

بـــە گــــــاوەسنی ســــەعی و حـــــەولدان

هەستی، لەوچوو زەینی، لێچوو

شێـــــف و وەردی کـــــــە زەویـــەکەی ویـــجدان

**(مەلا عەبدولقادری سەعیدی)**

## دابەش کردنی دوو لایەنی لێکچواندن لە رووی تاکی و تێکەڵاوی:

١. هەردوو لایەنی لێکچواندن (لێچوو «مشبه» و لەوچوو «مشبەبە») تاك و ئازاد بن و شتێکیان پێوە نەلکابێ.

لێکچواندنی تاك: لێکچواندنێکە کە ئەگەر لەوچوو شتێك بێ یان ئاوڵناوێك یان ئاوڵناوگەلێك بێ کە شوبهێندرا بن هەر لەو لەوچووە بە دەست هاتبێتن.

بە زولف و ئەبـــرۆ و مـــوژگان و خـــەت و پەرچەم و باڵا

١ ٢ ٣ ٤ ٥

کـــەمەند و تیغ و تیر و جـــەوشەن خەفتانی والایی

١ ٢ ٣ ٤ ٥

بەستراو (مقید): دوو لایەنی لێکچواندن یان یەکێ لە ئەو دوو لایەنە بەستراوە بە ناوێکی زیادبوو یان ئاوەڵناوێکەوە. وەکوو:

سیب غەبغەب چون خوانساری باغان نە تـــاق ابرووش بـــی وە چـــراغان

لێچوو لەوچوو

(خانای قوبادی)

نەبەستراو (غیرمقید): دوو لایەنی لێکچواندن نەبەستراوە بە ناوێکی زیادبوو یان ئاوەڵناوێکەوە. وەکوو: چرا وەك هەتاو ئەدرەوشی.

٢. مشبە (لێچوو) رەها (مطلق) و مشبەبە (لەوچوو) بەستراو (مقید) بێ.

بە چێهرە وەك مەهی رەوشەن بە زولفەن حەلقەیی جەوشەن

لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو

بە کوڵمەن وەك گوڵی گوڵشەن بە لەب غونچەی نسارانن

لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو

(میسباح ـ ئەدەب)

٣. مشبه (لێچوو)ی بەستراوە، مشبەبە (لەوچوو)ی رەها بێ.

شوعلەی روخی تۆ تیرە گەهێ زولفی سیەهـ فام
لێچوو لەوچوو لێچوو

مەهتابە کە تێکەڵ شەوی یەلدایە لە باڵا
لەوچوو

(میسباح)

٤. مشبە (لێچوو) و مشبەبە (لەوچوو) بەستراو (مقید) بن. وەك:

بە کووی غەبغەبەش ماچی قەترەی ئاو موعەللەق مەدران نـە پای ئافتاو
لێچوو لەوچوو

(خانای قوبادی)

٥. تشبیە مرکببەمرکب (لێکچواندنی لێکدراو بە لێکدراو) "(محەمەدی، ١٣٦٤: ٤١)": ئەوەیە هەر یەك لە دوولای (تشبیە) دەبێ هەیئەتێ بن کە ساز بووبێتن لە دوو یا چەند (تشبیە) بە جۆرێك تێکەڵاوی یەك بن، کە وەك یەك شتیان لێ هاتبێ و لە ئەم لێکچواندنەدا هیچ کام لە ئەو (تشبیە)دا بە تەنیایی مەبەست نین بەڵکوو پێکەوە یەك شتیان گەیاندووە.

سەری کوڵمەت لە نێو زولفی سیادا ئیشارێکە لـــــە نووری شەوچرادا
لێچوو لەوچوو

(وەفایی)

## دابەش کردنی دوو لایەنی لێکچواندن بەهۆی ژمارەی ئەوانەوە کـە چوار بەشە:

تشبیە (ملفوف)، تشبیە (مفروق)، تشبیە (تسویە)، تشبیە (جمع).

١. تشبیە (ملفوف): ئەوەیە کە لەوچوو لە لایەك و لێچوو لە لاییکیترەوە بن.

به کوڵمە و ڕوومەت و ڕان و بە مەمك و سینە و گەردن

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦

عەقیـــق و لەعل و یـــاقووت و دوڕ و بلوور و مینایی

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦

(میسباح)

٢. تشبیه (مفروق): ئەویش بریتیە لەوە کە لەوچوو لەگەڵ لێچوو خۆی پێکەوە لای یەك سان درێن.

لەنجەی تاووس، خەتی کـــەبك، پـــــــەروازی شەهین

لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو

ســـــەوتی بولبول، خاڵی قومری، چەشمی شەهبازی هەیە

لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو

(میسباح)

٣. تشبیه (تسویه): ئەوەیە لەوچوو یەك بێ بەڵام لێچوو زیاتر بێ.

داروبەرد وەك من دەسووتا دەرنـــەما هـــەیوان نەما

لێچوو لەوچوو

زاهیر و باتـــین چـــــرا بـــوو دار چـــــــرا هەیوان چراغ

(وەفایی)

٤. تشبیه کۆ (جمع): ئەوەیە لێچوو یەك بێ بەڵام لەوچوو زیاتر بێ.

شەکەرلەب و شاهیدی شیرین بوتی چین لوعبەتی ماچین

لەوچوو لەوچوو لەوچوو

ســـــەراپا سۆسەن و نەســـــرین چ لەب نووشین دلارائی

لەوچوو لەوچوو

(میسباح)

«لێچوو» تۆوە، کەسی دووەمی تاکە، کە نادیارە.

**دابەش کردنی لێکچواندن بەهۆی لێچوون و لەم ڕێگەوە چەند بەشە:**

**١- (لێکچواندن) تشبیه تمثیل و غیر تمثیل**

**٢- (کــورت) مجـــمل و (بـەربڵاو) مفصل**

١. تشبیه (تمثیل) "(محەممەدی، ١٣٦٤: ٤١)": ((ئەوەیە لێچوون لە ژمارەی وەرگیرابێ هەرچەند بەشەکان و ئەندامی یەك شت بن کەوابوو (تشبیە)ی سوورەتێکە بە سوورەتێکی دیکە)).

هەروەکوو قەوس و قەزەح با دەس لە گەردن دانیشین

تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سەوز و، من بە ڕەنگی زەردەوە

**(تاهیربەگ)**

هەیئەت و شێوە و ڕواڵەتگەلێك وەك سوخمەی ئاڵ و سەوز و ڕەنگی زەرد شوبهێندراوە بە قەوس و قەزەحەوە.

٢. تشبیه (غیرتمثیل): ئەوەیە لێچوون لە ژمارەی وەرنەگیرابێ.

مەڵێن کەڵکی نەبوو ڕوویی جەهەننەم سـەرم قـەڵغانە بـۆ تیری قـەزاتان

**(کوردی)**

٣. تشبیه (مفصل): ئەویش ئەوەیە کە لێچوون لەوێدا گوترابێ.

ئەڵێن بەرگی فریشتەی ئاسمانـیش سپییە وەك بەفرە

لێچوون

فریشتەی ئێمە باڵایە، بەڵام ئاخ بۆ چ ئەخوێن تەفرە

**(پیرەمێرد)**

٤. تشبیه (مجمل): ئەوەیە لێچوون لەودا نەکوترابێ.

وەنەوشە بە گـەردنکـەچی وەك هەتیو دڵۆپە لە ئـەشکەوت وەك شـووشەزیو

لێچوو لەوچوو لێچوو لەوچوو

**(قانع)**

((لێچوون)) مات و پەشێو و خەمبارییە کە نەگوتراوە. ((لێچوون)) ڕوونی و زوڵاڵییە کە نەگوتراوە.

## دابەش کردنی (لێکچواندن) لە رووی (ادات) ئامرازەوە:

١. تشبیه (مرسل): ئەویش ئەوەیە کە ئامرازی لێکچواندن لەوێدا گوترابێ.

ئیسسە دڵسۆپی چاوی هەتیوە          لە پای تاجەکەی وەك قسوپکەی زیوە

ئامرازە

٢. تشبیه (مؤکد): ئەوەیە ئامرازی لێکچواندن تێدا پەڕیبێ.

تۆ قازی و من شاهین، مەقرێنە بە دەورەمدا

نەك حەملە بەرم گیر کەم چنگێ لە چیقڵدانت

بۆ من قەڵەمە نەیزە، بۆ تۆ سوپەرە دەسگا

بۆ تەجرەبە با لێدەم یەك حەربە لە قەڵغانت

**(سالم)**

لەم دوو هەڵبەستەدا ئامراز پەڕیوە.

٣. تشبیه (بلیغ): ئەوەیە ئامراز و لێچوون پەڕاندرابێ.

لەلایێ هەڵسسکراون قۆڵی زێوین          لسە لایێ دەرخراون پسووزی بلوور

**(سەیفولقوزات)**

لە «قۆڵی زێوین» و «پووزی بلوور» لێچوون ئاوڵناوی (سپیە). ئامراز پەڕاوە.

٤. تشبیه هەڵگەڕا (مقلوب): ئەوەیە لەوچوو لە جێی لێچوو دانرێ و وا نیشان درێ کە لێچوون کامڵترە.

ئەستێرە بەرزەکان ئەدروشسێنەوە بسسە شەو

لێچوو

وەك من بە داخەوە نە سرەوتنیان هەیە و نە خەو

لەوچوو

**(پیرەمێرد)**

## شێوەکانی تری لێکچواندن:

الف: وشەی "ئاسا" بۆ لێکچواندنێکی بەهێز دێت. وەك: "پاڵەوانئاسا کارەکەی کرد". "تۆ ئاسا میوانەکانی بەڕێ کرد".

ب: پاشگری (انه): کە بۆ لێکچواندن دێت. وەك: پیاوانە بە دەنگیانەوە چوو، وەستایانە خانووەکەی چاك کردەوە. ئەم لێکچواندنە دەشێت زۆر بەهێز نەبێت، بەڵام لێکچواندنیش پلەی هەیە.

پ: جاری وا هەیە لێکچواندنەکە وا پیشان دەدرێت کە ئەو لێکچووە کوتوومت لێکچوێنراوەکەیە و سیفەتە تەواوەکەی ئەوی هەیە. ئەمەش لێکچواندنێکی بەهێزە. دەڵێن: لەشی پۆڵایە، لێوی یاقووتە. چاوی ئەستێرەی بەیانە. دیارە بە مەبەستی زیادەڕەویی (مبالغە) کردن لە سیفەتێکدا ئەمە دەوترێ، «دڵ مێشە بە هەموو کەسێکەوە دەنیشێتەوە».

ت: جاری وا هەیە بە فرمانێك واتا لەگەڵ فرمانێکدا دێتە بەر چاو، وەك: گەربیبینیت وادەزانیت مانگی چواردەیە. گەر بچیتە ماڵەکەیانەوە دەڵێی چوومەتە بەهەشتەوە.

ج: یەکسەر و راستە و راست سیفەتێك بەو کەسە یان بەو شتە بدەیت و بیکەیت بەو کەسە یان بەو شتەی کە پێی دەچوێنرێت.دەڵێن: شێر کە لە بێشە هاتە دەر چ نێر بێ و چ مێ.

چ: جاری وا هەیە وشەیەك بە تایبەتی کە کۆبێت وەك (ژنان، کوڕان، کچان) «ێ» لێکچواندن یا بڵێن نیسبی پێوە دەلکێنرێت و سیفەتی ئەو وشەیەی دەدرێتە پاڵ وەك ژنانەیە، واتە رەوشت و خووی مێینەی هەیە. کوڕانی‌یە، کچانی‌یە.

ح: هەر وشەیەك کە مانای دەڵێی یان وەك بگرێتەوە. وەك وشەی "چون".

مەولەوی دەفەرمێ:

*گوڵ چون رووی ئازیز نزاکەت پۆشان    بە فراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان*

خ: لێکچواندنی ئەو کەسە ئەو شتە بەشتێك وەك بووە بە شێر. بووە بە سەگ. بووە بە کەوڵ سووری بەر لەشکر، بووە بە پاڵەوان. واتە سیفەتی ئەو شتە، ئەو کەسە، ئەو زیندەوەرەی ئەدەیتێ.

د: شێوەیەکیتری لێکچواندن دەڵێ: پێستی ئەو زیندەوەوەرەی بەسەرخۆیدا کێشاوە: وەك پێستی رێوی بە سەر خۆیدا کێشاوە. واتە بووە بە رێوی لە فێڵبازی و ناڕاستیدا. پێستی بەرازی بە سەر خۆیدا کێشاوە. واتە وەك بەراز بێبەزەیی بووە.
**(مەحموود عەلی، ۲۰۰۱: ٥ و ٦)**

## بەشی دووەم:

لێکچواندن لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا لەم بەشانەی خوارەوە پێك دێت:

١. لێچوو ٢. لەوچوو ٣. لێچوون ٤. ئامرازی لێکچواندن.

بۆ وێنە: «قسەی وەك قوڕی دوای باران وایە».

«وەك چرا وایە، سێبەری بۆ خۆی و تیشکی بۆ بێگانەیە». (خاڵ. ٤٧٢)

«وەك نیسك وایە بەر و پشتی بۆ نییە». (خاڵ. ٤٧٥)

لەم پەندەی دواییاندا «ئەو» لێرەدا کەسی سێهەمی تاکە، چرا (لەوچوو)یە، تیشك (لێچوون) و (وەك) ئامرازی چواندنە.

لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا، بە پێی ڕێزمان، سێ جۆر لێکچواندن بەکار ئەهێنرێ:

### ١. لێکچواندنی «تەواو» یان «ئاوێتە»:

بریتییە لە (لێچوو) و (لەوچوو) و (لێچوون)، بەڵام لە پەندی پێشیناندا ئەم لێکچواندنە تەنیا بریتیە لە (لێچوو) و (لەوچوو) کە لە کۆمەڵە زاراوەیەکی سەربەخۆ دروست بووەو هەموویان پێکەوە شێوەیەکی ئاوێتە پێك دێنن، وەك:

«دڵ بەرد نییە، لە پەڕەی گوڵ ناسکترە». (خاڵ. ٢٢٠)

«دنیا موستیلەیەکە بە هەوەسی خۆی ئەیسوورێنێ»
«رەقە وەك توو، رەشە وەك موو، دەولەتی باوکی ئەیدا بە شوو». (خالّ. ٢٥٦)

## ٢. لێکچواندنی کورت کراوە (تەواو نەبوو):

بریتیە لەو جۆرە لێکچواندنەی کە بە لێچوو، و لەگەلّ لەوچوو بە یەك زاراوە دەرئەکەون و وشەی زیادە و دیاری کراوی‌تریان نییە. لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقدا زیاتر ئەم جۆرە لێکچواندنە باوە.

لە بەشی هەرەزۆری پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا (ئەو)ی «جێ ناوی» کەسی سێهەمی تاك دەرئەکەوێ، وەك:

«ئەلێی خۆلّی مردووی بەسەرا کراوە». (خالّ. ٤٤)

لێرەدا «ئەو»ی نادیار کەسی سێهەمی تاکەو «ئەلێی» ئامرازی لێکچواندنە.

یان: «بێدەنگە وەك مێروو، بەسامە وەك نێروو». (خالّ. ١٣٢)

«ئەلێی بەردی بن گۆمە». (خالّ. ٤٣)

«ئەرز وەك چەرمی گا وایە».

وەك ئەبینرێ، لەم پەندانەدا «لێکچواندن» بێ وشە و زاراوەی زیادە و روونکردنەوە دەرئەکەوێ.

## ٣. لێکچواندنی کراوە:

بریتییە لەو جۆرە لێکچواندنەی «لێچوو» و«لەوچوو» و ئامرازی لێکچواندن لەگەلّ ڕستەو زاراوەی‌تردا دەرئەکەوێ و زۆربەی کات لەگەلّ «دیاری کراو» خۆی ئەنوێنێ.

وەك: «مالّ و دەولەت چلکی دەستە». یان «پارە چلکی دەستە». (خالّ. ١٣٦)

«ئینسان وەك گا هەر لە پێستێکدا نابێ». «دنیا گولێکە، هەردەم لە چەشنێکە».

لەم پەندەدا «ماڵ و دەوڵەت»، لێ چووە و چڵك «لەوچووە» و بە یەك گرتنیان دیاری کراو زیاتر دەرئەکەوێ و ئەچەسپێ.

زۆر جاریش لەم جۆرە لێکچوونەدا وشەی «باشتر» و «خراپتر» زیاتر مەبەستە کە لە بەشی «دژیەك»دا روون ئەکەنەوە، وەك: «هاوڕێیەکی باش لە دە برای خراپ باشترە».

لە هەندێ پەندا لێکچواندن بەهۆی ئامرازی لێکچوونەوە دەرئەخرێ، وەك: (ژ، لە، مینا، ئەڵێی، چوون، وەکوو).

لەگەڵ ئەوەشدا لەم جۆرە پەندانەدا ئەتوانرێ بە بێ ئەم لێكدەرانە مەبەستە کە دەربخرێ، وەك:

«پارە چڵکی دەستە». «کچ قەڵایە ناگیرێ». (خاڵ. ٣٢٩)

«دڵ سفرە نییە بۆ هەموو کەس بکرێتەوە». (خاڵ. ٢٢٠)

## بناغەی جۆرەکانی لێکچواندن بۆ ئەمانەش بەکار ئەهێنرێ:

١. بۆ پێوانەی جۆر و «خاسیەت»ی دیاردە، وەك: رێوی گەڕیدە لە شێری نوستوو باشترە. ـ کوچکی بەکار ژ شیری بێ‌کار چاترە.

**الف:** بۆ روونکردنەوە و ئاشکراکردنی دیاردە بەجۆرێکی وا کە تێگەیشتنی ئاسان بکات، وەك: «ساتێك بژی و شێر بی، نەك سەد ساڵ و لە ژێر بی».

ب: بۆ نزیك کردنەوە و یەکخستنی واتای لە یەك دووری رووداو، وەك: «وڵات ژ دێ (دایە) شیرین‌ترە» یان: «بەدترین لەبەد بەدترە، بەد لە بەدترین چاکترە».

٢. لێکچواندنی «سەلبی» بریتییە لەو لێکچواندنەی کە ئەو باس و رووداوانەی لێیان ئەدوێ و لەیەك ئەچن کە ئەتوانرێ لە برێیەکی بەکار بهێنرێن، وەك:

«هەرچی سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نییە».

بەجۆرە، گرنگی لێکچواندن لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی لەوەدایە کە دەوری جۆراوجۆر ئەبینێ.

لێکچواندن لەبەر ئەوەی «دەروون»ی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان ئەڕازێنێتەوە شێوەی «کەسایەتی» - واتا «شخصی» تایبەتی ئەکات و بیرکردنەوە دەربارەی قووڵ ئەکاتەوە و شێوەیەکی گشتیشی ئەداتێ وەك: ئەڵێی دڕکی مەم و زینە. **(ڕەسووڵ و تەقی، ١٩٨٤: ٧)**

## کارتێکەری پەندی پێشینیان و لێکچواندنە فۆلکلۆرییەکان لە سەر زمان و مرۆڤ:

پەندی پێشینیان (Proverb) و لێکچواندنە فۆلکلۆرییەکان خشڵی ڕازاندنەوەی زمانی کوردین. ئاوێنەی دەوڵەمەندی و جوانی و زیندوویی و پێشکەوتنی زمانەکەن و لە ناو جەرگی کۆمەڵەوە هەڵقوڵیون. سەرچاوەیەکی ڕوونی ڕۆشنبیری و پەروەردەکردنێکی باڵای کۆمەڵن. هەروەها ڕانومایی مرۆڤی کورد دەکەن و هانی گرتنی ڕێگە و خووی جوان و بەرز و چاك دەدەن. جار وا هەیە ڕای خۆت بەرانبەر بە هەڵوێستێك، بارێك، کەسێك، سیفەتێك بە چەند وشەیەکی سادە دەربڕیت؛ بەڵام تۆ بە لێکچواندنێك دەری دەبڕیت تا قسەکەت بەهێز و خۆشتر و کاریگەرتر بێت، جوانتر و چاکتر سەرنج ڕابکێشێت و بچێتە دڵەوە و خۆشی بە دڵ و دەروون بدات و چاو ڕوون بکاتەوە. **(مەحموود عەلی، ٩٨٢: ١٨و١٩)**

بڕوانە بۆ ئەمانە:

دەڵێی کاسەی چەورە - دەڵێی پێ بە هێلکەدا دەنێت - دەڵێی بە دەم داینـاوە - وەك گوڵ ئەشکۆفێتەوە و... .

### واتای سەرەکی مەسەل:

رستەیەکی کورت و رەوان و بەئاهەنگە، بە شێوی خواستنی تەمسیلی (استعارە تمثیلە) بۆ هێنانی بەڵگە یان ئامۆژگارییە،کە زۆر جار بە بێ گۆڕانی وشە نـاویانگی دەرکردووە.(پارسا، ١٣٨٤: ٨)

ئاو لە بێژنگ ـ سەبەتە دەکات: واتای رەنجی بێهوودە دەدات.

(لەوچوو) مشبەبە (لێچوو) مشبە پەڕیو

هەر کەسێ سمێڵی سوور بێ هەمزەئاغایە؟ ـ دەیەوێ ماسی بگرێ و قوڵی تەڕ نەبێ.

### بنەمای لێکچواندنی مەسەل:

ئەگەرچی بنەڕەتی سەرهەڵدانی مەسەل هەمان لێکچواندنە بەڵام لابردنی لێچوو (مشبە) شێوەی خواستنی پێداوە. هەرچەند مەبەستی وتنی مەسەل لێکچواندنی راستییە بە رووداوێك یان چۆنایەتی ناو مەسەلەکە خۆیە، بەڵام لە مەسەلدا (لێچوو) چۆنایەتی لابراوە. (پارسا، ١٣٨٤: ٦)

بە بۆچوونی هەندێ لە زمانەوانان زمان بە گشتی هیچ نییە جگە لە لێکچواندن و خواستن (استعارە). بەم شێوە، زمان هەمووی سیمبۆڵ و نیشانەیە، بەڵام گرنگی لەوەدایە کە گەلان و فەرهەنگی جۆراوجۆر هەرکام بە شێوەی جیاواز ئەم رەوەندە بەکار دێنن.

بۆ نموونە لە کوردیدا بە پیاوی گێل و گەوج دەڵێین "گا"یە، کەچی لە زمانی ئینگلیزیدا ئەم "گا" واتای بەهێز و توانای هەیە. (یارمحەممەدی، ١٣٧٢: ١٧) (بە وتەی پارسا)

لێکچواندن بەشێکە لە تان و پۆی مەجازی زمان. هەندێ لە چواندنەکان بەهۆی لێچوونی بەهێزتر، زۆرتر کەوتوونەتە سەر زمانان. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی

توێژینەران ئەمانە لە ناو مەسەلەکاندا کۆ بکەنەوە. "دێهخودا" بەم لێکچواندنانە دەڵێ (لێکچواندنی تەمسیلی). وەك ئاو: فێربوونی بابەتێك بە باشی. وەك ئاگرپارە: چابوك و چالاك. وەك منالێ: زوو توورە ئەبێ و زوویش ئاشت ئەکاتەوە.

**تێبینی**:

لێکچواندن لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقی کوردیدا بەڕواڵەت لێکچواندنە؛ ئەمانە لە بنەڕەتدا کینایەن چون لێچوو یان (ئەو)ی جێ ناوی کەسی سێهەمی تاك لە ناویاندا پەڕاوە و ئامرازی لێکچواندنیان گرتووە وەك: وەك شەم، شەوقی بۆ بنی خۆی نییە ـ وەك نیسك بەروپشتی بۆ نییە.

(ئەو) پەڕاوە= مشبە (لێچوو): وەك (ئامرازی تشبیە) - نیسك مشبەبە (لەوچوو) بەر و پشتی بۆ نییە.

## سەرچاوەکانی سەرهەڵدانی لێکچواندن لە پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقدا:

١. زۆر رووداو و کارەساتی مێژوویی کراوە بە نموونە و لەو جۆرە هەڵوێستانەدا بە کار دەهێنرێت کە بشێت پێی بچوێنرێت وەك:

دەڵێی خوێنی سیاوەحشە: بۆ قسەیەك، کارێك ، ئاشووبێك کە درێژە بکێشێت.

دەڵێی رەنجی فەرهادی داوە: بۆ کەسێك کە رەنجێکی زۆر بدات و رەنجبێوەر بێت و...

٢. زۆر کرداری رۆژانەی باش یان خراپ کە رووی داوە، کراوە بە نموونە و لێکچواندن و دەربڕینی واتایەکی تایبەتی. ئەڵێی جاو دەنێتەوە ـ ئەڵێی ئاو رۆشنکەرەیە.

٣. هەندێك لەسەر ئەفسانە و چیرۆکە کۆنەکان دانراوە و گەلێك کەڵك لە سەرگوزەشتە و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان وەرگیراوە و رستە و هەڵوێستی ناویان بۆ

دارِشتنی لێکچواندن بەکار هێنراوە وەك: دەڵێی مێردەزمەیە ـ دەڵێی مۆتەکەیە (شەوە) ـ دەڵێی ئەرژەنگی دێوە.

٤. کەڵك لە هەموو کەرەسە و کەلوپەلێك و شتێك وەرگیراوە کە لە ژیانی رۆژانەدا بەکار هێنراون، دەڵێی ئاگری بن کایە ـ شیری (شمشیری) میسرییە ـ وەك سەوەتەی بەن پچڕاوە.

٥. گیانی نوکتەبازی و گاڵتە و گەپ و پێکەنین و مەشرەبخۆشی یان تەوس و تەشەر لە زۆر لێکچواندنی فۆلکلۆریی کورددا خۆی نیشان دەدات. کەوڵەکۆنە ـ دەڵێی شێرە عەنتەرە ـ وەك مشك بان قاڵب ساون.

٦. گەلێك ناوی ئافرەت یان پیاو یان هی ئاژەڵ و ماڵات و زیندەوەریتر کراوە بە نموونە و بۆ لێکچواندن بەکار هێنراوە، لەبەر سیفەتێك، کارێك، کە پێوەی دەرکەوتووە وەك: دەڵێی فاتە سوورەوانە ـ دەڵێی دڕکی مەم و زینە ـ دەڵێی کەڵەشێری سەربارەدارە ـ دەڵێی مارە.

٧. زۆر ناوی کەس یان شوێن بە لێکچواندن نەمری بۆ خۆی پچڕیوە: دەڵێی رەنجی فەرهادی داوە ـ مارەکەی شێخ هۆمەر ـ دەڵێی سەگی هەوشارە.

٨. کورد کەڵکی زۆری لە هەموو زیندەوەرێك وەرگرتووە بۆ بەراوردکردن و لێکچواندنی مرۆڤێك بەو زیندەوەرە بۆ سیفەتێکی باش یان خراپ یان جووڵانەوە و هەڵسوکەوتی کەسێك بۆ هەڵنان یان شکاندن و سووك کردنی ئەو کەسە یان هەر بۆ دەربڕینی سیفەتێك و هیچیتر.

هەروەها کەڵك لە هەموو ئەندامێکی ئەو زیندەوەرانە وەرگیراوە. لەناو ئەو زیندەوەرانەشدا ناوی سەگ، گورگ، رێوی و... زۆرتر دێنە بەر چاو بۆ ئەو لێکچواندنە، وشەی (وەك) یان (دەڵێی) بەکار هێنراوە. وەك: وەك ماری پێ لەسکە ـ وەك کەری دەروێشە ـ وەك سەگ دەپاڕێتەوە.

جاری واش هەیە ئامرازی لێکچواندیش فڕێ دەدرێت وەك: قەڵتاخەکۆنە ـ شێرە

بەفرینەیە.

بەڵام بەشی هەرەزۆری ئەو لێکچواندنانە لێکچواندنی بالآیە کە لەگەڵ لێکچواندنی سادەدا جیاوازییەکی گەورەی هەیە. چونکە ئەم شێوە کینایە، رەگی لەسەر زەمینەیەکی مێژوویی پتەو دارشتووە و مانای قووڵە و پێویستی بە لێکدانەوە و بەدوادا گەڕانێکی زۆر هەیە تا تێی بگەیت. ئەمە لێکچواندنی کینایەیە■ **(مەحموود عەلی، ۹۸۲: ۳۰)**

ꕥ ꕥ ꕥ

ئەم فەرهەنگە داگری هەزار و دووسەد پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقە کە هەرکام لەمانە بەسەرهات و بۆنە و چیرۆك و سەرگوزەشتەیەکی تایبەتییان هەیە و رۆڵێکی گەورە دەبینن لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زماندا، جگە لە ئامۆژگاری، هەر یەکەیان واتا و مەبەستێکی تازەیان تێدایە بۆ بەردەنگ و زمان و هەروەها رەنگدانەوەی باری کۆمەلایەتی ئەو گەلەن کە ئەم پەندانە بەکار دێنن. دە ئەوەندەیتر لەم پەندانە لە لادێ و ناوچە کوردەوارییەکاندا ماون و ئەمانە کەلەپوورێکی بەنرخن و دەبێ کۆ بکرێنەوە و لە فەوتان بپارێزرێن. منیش بە پێی هێز و توانای خۆم شانم دا بەر ئەم ئەرکە و بەڵێنم دا جێگە پایەك دانێم و دەست و پایەك بکەم و لە دەریای بێ بنی ئەدەبیاتی گەلەکەمدا هەنگاوێك هەڵگرم با کەمیش بێ باشترە لەوەی "دەس لە بان دەس دانێم و پەنجە هەڵپێکم". لە کۆتاییدا لە زانایان و رووناکبیران داوا ئەکەم بە ئارەزووی خۆیان بەرهەمەکەم بژار بکەن و هەڵەکانم پیشان بدەن، زۆر خۆشحاڵ دەبم و بە داوەریی خوێنەری هێژا و خاوەن ویژدان کە کڵاوی لە راستی دڕابێ قایل دەبم، چونکە وەك دەڵێن: (ماڵی قەلب، سەر بە خاوەنیەتی – دیاری شوان ئاڵەکۆکە).

**خوێنەرانی هێژا!**

لەم فەرهەنگەدا لە بڕێ شوێن ئەگەر ویستبێتمان ئاماژە بکەینە سەر سەرچاوەیەك تەنیا لە «وشەیەك» کەڵکمان وەرگرتووە، وەك ئەوەی ئەگەر لە شوێنێك نووسرابێت «خاڵ» مەبەست: شێخ محەممەد خاڵ دانەری کتێبی پەندی پێشینیانە.

کورتکراوەکانی هەمووی ئەو جۆرە وشانە لە خوارەوە نووسراون.

## کورت کراوەی ناو و سەرچاوەکان

١. ئەهوەن: محەممەد ئینسافجوویی دانەری کتێبی پەند و مووچیاری گەورەکانمان.

٢. جلال محمود: جەلال مەحموود عەلی دانەری کتێبی ئیدیۆمی ١و٢.

٣. حیرت: عەبدولحەمید حیرت سەجادی دانەری کتێبی پەندی پێشینیان بەرگی ١و٢.

٤. خاڵ: شێخ محەممەد خاڵ دانەری کتێبی پەندی پێشینیان.

٥. رخزادی: عەلی رخزادی دانەری گوارەی کوردەواری.

٦. ڕەزا کەلهوڕ: ئەکبەر ڕەزایی کەلهوڕ دانەری کتێبی یەك هەزار واتەیٚ پێشەنان کوردی (کەلهوڕی)، بەرگی ١.

٧. عەبدولوەهاب: عەبدولوەهاب کا نەبی شەریف دانەری کتێبی فەرهەنگی ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا.

٨. فتاحی قاضي: قادر فتاحی دانەری کتێبی امثال و حکم کوردی بەرگی ١و٢.

٩. مردۆخ: شێخ محەممەد مەردۆخ دانەری کتێبی فەرهەنگی مەردۆخ بەرگی ١.

١٠. هەژار: عەبدوڕڕەحمان شەرەفکەندی دانەری فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگی کوردی ـ فارسی.

**ئەڵێی ئاشی ئاوکەوتووە:** بە ماڵێك ئەوترێ، کە لەبەر هەژاری یا چۆڵی بێدەنگ و کش و مات بێ. (خاڵ.پ.٤٢) **ف [به خانه یا منزلی گفته میشود که به علت فقر و نداری ساکت و بی سر و صدا باشد.]**

**ئەڵێی ئاگری بن کایە:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە ژێرەوە دنەی کەسێك بداو و بەسەر زاریش دۆستی بێ. (خاڵ.پ.٤٢) **ف [به کسی گفته میشود که پنهانی با کسی دشمنی کند ولی در ظاهر دوست او باشد.]**

**ئەڵێی ئاو لایداوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە لەبەر نەزانی، یا خەفەتباری خۆی، بێ دەنگ بێ. (خاڵ.پ.٤٢) **ف [به کسی گفته میشود که به علت ناآگاهی و غم و غصه ساکت شده باشد.]**

**ئەڵێی ئەسپی بۆ زین کراوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بەپەلە بێ، لەسەر رۆیشتن بۆ شوێنێك. (خاڵ.پ.٤٢) **ف[به کسی گفته میشود که برای رفتن به جایی عجله داشته باشد.]**

**ئەڵێی ئەسپێی کراس کۆنە:** بە یەکێك ئەوترێ کە پێتەوە نووسا بۆ شتێك، لێت نەبێتەوە. (خاڵ.پ.٤٢) **ف[به کسی گفته میشود که خواهان چیزی از طرف تو باشد و از تو جدا نشود.]**

**ئەڵێی بەردی ئاوەسووە:** بە یەکێك ئەڵێن کە رووی قایم بێ. بە هیچ لە روو نەچێ. (خاڵ.پ.٤٣) **ف [به کسی گفته میشود که پررو و بیشرم باشد.]**

**ئەڵێی بەردی بن گۆمە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بێ دەنگ دانیشتبێ. (خاڵ.پ.٤٣) **ف [به کسی گفته میشود که آرام و ساکت نشسته باشد.]**

**ئەڵێی بەرزەکی بانانە:** بە یەکێك ئەوترێ لە گۆبەنگێکا دەستی ببێ کەچی رزگاریشی ببێ. (خاڵ.پ.٤٣) **ف [به کسی گفته میشود که در واقعه یا حادثهای دست داشته باشد اگرچه رهایی پیدا کرده باشد.]**

**ئەڵێی تەرازووی بەن پچڕاوە:** بە یەکێکی دەستەپاچە دەڵێن. (خاڵ.پ.٤٤) **ف [به کسی که دچار دستپاچگی و سراسیمه شده باشد گویند.]**

**ئەڵێی تەلای دەستەوشار و گەنجی باوەی دۆزیوەتەوە:** تەلای دەستەوشار گونکێکی گەورەیە لە زێڕی نەرم کە لە چینەوە بە دیاری نێردرا بۆ شای ئێران (خوسرەوی پەروێز) و ئەو زێڕە هەرچەند لە ناو دەستا بگوشرایە لە بەینی پەنجەکانەوە هێندێکی لێ ئەهاتە دەرەوە، لە پاشا کە دەستی لێ بەرئەدرا زێڕەکە وەك خۆی لێ ئەهاتەوە. گەنجی باوە: گەنجێکی بەناوبانگە کە ون بووە، و هەزاران

ساڵە بە شوێنیا ئەگەڕێن. (خاڵ.پ.٥١٩) ڤ[بە چیزی پرارزش و گرانبها گفته می‌شود. (تەلای دەستەوشار) که طلای افسانه‌ای است و عبارت بوده از چونەی بزرگی از طلای خمیری و نرم که از کشور چین به عنوان هدیه برای خسرو پرویز پادشاه ایران فرستاده می‌شود. وقتی در مشت می‌گذاشتند و بر آن فشار می‌آورند از دو سر و از میان انگشت‌ها بیرون می‌آمد و هنگامی که مشت را باز می‌کردند به شکل قبلی خود برمی‌گشت. (گەنجی باوە): گنجی مشهور بوده که مفقود شده و هزاران سال است که به دنبال آن می‌گردند.]

**ئەڵێی تێلای قووت داوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە قسەی بە ڕەوانی پێ نەکرێ. (خاڵ.پ.٥٢٠) ڤ[به شخصی گفته می‌شود که فصیح و شیوا سخن نگوید.]

**ئەڵێی پشیلەی کەللەخانەیە:** بە یەکێکی کەللەزلی قەڵەو ئەڵێن. (خاڵ.پ.٤٣) ڤ[به کسی کله گنده و چاق گفته می‌شود.]

**ئەڵێی پیرەژنی دۆرژاوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە خەمێکی لێ نیشتبێ. (خاڵ.پ.٤٣) ڤ[به کسی گفته می‌شود که دچار غم و غصه‌ای شده باشد.]

**ئەڵێی جاشی ماکەرێکن:** زۆرتر بە دوو کەسی خراپی هیچ و پووچ ئەوترێ کە لەیەك بچن. (خاڵ.پ.٤٤) ڤ [به دو کس بدکار و هیچ و پوچ که به هم شبیه باشند گفته می‌شود.]

**ئەڵێی جن پیا تسیوە:** بە شتی بێ پیت ئەوترێ. (خاڵ.پ.٤٢) ڤ [به چیز کم‌دوام و ناپایدار گفته می‌شود.]

**ئەڵێی جن گۆڕیوێتی:** بە منداڵی زۆر ناشیرین ئەوترێ. (خاڵ.پ.٤٤) ڤ [به بچه‌ای بسیار زشت گفته می‌شود.]

**ئەڵێی جیوەی تێکراوە:** بە یەکێکی زۆر بزیو ئەڵێن. (خاڵ.پ.٤٤) ڤ [به کسی ناآرام و زیرک گویند.]

**ئەڵێی حەمامی ژنانەیە:** بە کۆڕێك ئەوترێ کە هەر یەکە لە ئاستی خۆی بە دەنگی بەرز قسە بکا، بێ ئەوەی گوێ لە یەکێکی‌تر بگرێ. (خاڵ.پ.٤٤) ڤ [به مجمعی یا مجلسی گفته می‌شود که هر کدام در برابر خود با صدای بلند حرف بزنند بدون اینکه هیچکدام به سخنان دیگری گوش فرا دهد.]

**ئەڵێی خۆڵی مردووی بەسەرا بێژراوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە مات و خەفەتبار دانیشتبێ. (خاڵ.پ.٤٤) ڤ [به کسی گفته

می‌شود که ساکت و غمگین نشسته باشد.]
**ئەڵێی خەرەنگەزی بن کلکی گایە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر قسە بزرنگێنێتەوە و لەسەر شت بڕوا. *(خاڵ.پ.٤٥)* **ف** [بە کسی گفتە می‌شود که حرفی را زیاد تکرار کند و بر آن پای بفشارد.]
**ئەڵێی دۆمی خەلاتکراوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە یەك پارچە کالآی تازەی لەبەردا بێ و بەرگەکانی تری هەمووی کۆن بێ. *(خاڵ.پ.٤٥)* **ف**[بە کسی گفتە می‌شود که فقط یک تکە لباسش تازە و نو پوشیدە و بقیە لباسهایش کهنە باشد.]
**ئەڵێی دار واوەیلایە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر لەڕ و لاواز و رەق و تەق بێ. *(خاڵ.پ.٤٥)* **ف**[بە شخصی بسیار لاغر و مردنی گفتە می‌شود.]
**ئەڵێی دێزەی رەشە:** بە پیاوێکی بێوەی ئەوترێ کە لەناوبردنی بە خراپە مەردم تووشی زیان ببێ. *(خاڵ.پ.٤٥)* **ف**[بە شخصی بی‌آزار گفتە می‌شود کە هرگاه کسی از او بە بدگویی یاد کند دچار رنج و آزار خواهد شد.]
**ئەڵێی رۆنی سەگ ئەدەن لە لەشی:** بە یەکێك ئەڵێن کە بە زەرەری مەردم کەیف خۆش بێ. *(خاڵ.پ.٤٦)* **ف** [بە کسی گفتە می‌شود کە از ضرر و زیان دیگران خوشحال شود.]
**ئەڵێی زماوەنی‌کەرە:** بە یەکێکی پۆشتە و پەرداخ و تەرپوش و شاد ئەڵێن. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٨٠)* **ف** [بە شخصی همیشە خوشحال و شیک‌پوش گویند.]
**ئەڵێی سای مەل لێی داوە:** کەسێکی گێژ و وێژ و سڕ و سەپۆل. *(خاڵ.پ.٤٦)* **ف** [انسانی ناآگاه و مردنی و بی‌احساس.]
**ئەڵێی سەگی پێ سووتاوە:** بە یەکێکی خۆێڕی و گەڕۆك ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٤٦)* **ف** [بە کسی بیکار و هرزەگرد و بی‌هدف گفتە می‌شود.]
**ئەڵێی سەگی هەڵەپاسە:** بە یەکێکی دڕی بێ حەیا ئەوترێ. **ف** [بە شخصی نترس و بی‌شرم گفتە می‌شود.]
**ئەڵێی سێوێکن، کراون بە دوو لەتەوە:** بە دوو کەسی جوان ئەڵێن کە لە شێوەدا زۆر لەیەك بچن. *(خاڵ.پ.٤٦)* **ف** [بە دو کس هم قیافە و زیبا کە بسیار شبیە بە هم باشند گفتە می‌شود.]
**ئەڵێی شەخسە پەڕۆیە:** ١) بە یەکێك ئەوترێ کە هەرچێکی لەبەرا بێ وەك پەڕۆی سەرشەخس شڕوور بێ. ٢) بە کەسێکیش ئەوترێ کە هیچ دەم و پل و قسەوباسێکی نەبێ و بێدەنگ داکەوێ. *(خاڵ.پ.٤٧)* **ف** [١)

بە کسی گفتە می‌شود کە لباسی پارە پارە و کهنە پوشیدە باشد. ٢) بە کسی گفتە می‌شود کە نتواند بە خوبی صحبت کند و سخنی برای گفتن نداشتە باشد و آرام و ساکت باشد.]

**ئەڵێی شەرواڵ بە کۆڵی خواردووە:** شەرواڵ بە کۆڵ= گیایەکی رەوانە، هەر کەسێك بیخوا ئەبێ شەرواڵەکەی بدا بە کۆڵیا. بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر رەوان بێ. *(خاڵ.پ.٤٧)* **ف** [بە کسی کە اسهال شدید یا بیرون‌روی داشتە باشد گفتە می‌شود.]

**ئەڵێی شەکرەسێوە:** بە کەسێك یا شتێکی زۆر شیرین یان یەکێکی رووخۆش ئەڵێن. *(عەبدولوەهاب.١٧٥)* **ف** [بە کسی یا چیزی شیرین یا بە کسی خوش‌برخورد گویند].

**ئەڵێی شەلاقەی باڵ شکاوە:** بە مەردمی شلەپەتە ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٤٧)* **ف** [بە کسی سست و نامنظم گفتە می‌شود.]

**ئەڵێی شەیتان تفی کردۆتە دەمی (ئەیژی شەیتان دەرسی داوە):** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر زیرەك و وریا و بێدار و ئاگادار و بزیو بێ. *(خاڵ.پ.٤٧)* **ف**[بە شخصی بسیار زرنگ و آگاە گفتە می‌شود.]

**ئەڵێی شێتە و بۆ بەرد ئەگەرێ:** بە یەکێك ئەوترێ بە شوێن شتێکا هەرا کا و نەیگرێ. *(خاڵ.پ.٥٢٠)* **ف** [بە کسی گفتە می‌شود کە بە دنبال چیزی بدود و آن را هم بە چنگ نیاورد.]

**ئەڵێی شێتخانەیە:** [بە جێگەیەك ئەڵێن یاسایەکی نەبێ و کەس لە کەس بێ. هەر کەس بۆ خۆی لە شوێنێ بێ]. **ف** بە جایی بی‌نظم و قانون گویند کە هر کس در جایی و گوشەای قرار گیرد.

**ئەڵێی شێرەژنە:** بە ژنێکی ئازا و بەجەوهەر دەڵێن. *(عەبدولوەهاب.١٧٦)* **ف** [بە زنی شجاع و باهنر و شایستە گفتە می‌شود].

**ئەڵێی گۆشتی قازی خواردووە:** بە یەکێك ئەوترێ کە دەنگی وەك دەنگی قاز زل بێ و زۆر دەنگەدەنگ بکات. *(خاڵ.پ.٤٩)* **ف**[بە کسی گفتە می‌شود کە صدایش شبیە بە صدای قو باشد.]

**ئەڵێی گەماڵی سەر دێڵە بە بایە:** بە یەکێکی دڕی شەڕانی ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٥١)* **ف** [بە شخصی نترس و شرور گفتە می‌شود.]

**ئەڵێی گەنەی گونی گایە:** ١) بە یەکێك ئەوترێ کە بە هەر شتێکەوە نووسا، لێی نەبێتەوە. ٢) بە کەسێکی بچووك و نابووتەش دەڵێن. *(خاڵ.پ.٥١)* **ف** [١) بە شخصی گفتە می‌شود کە با هر کسی کە بچسپد از او

جدا نشود. (مزاحم). ۲) همچنین به شخصی کوتوله هم می گویند.]

**ئەڵێی گورگی دەم بە خوێنە**: بە یەکێکی تاوانبار و زاڵم ئەڵێن. *(عەبدولوەهاب.۲۱٥)* ف[به شخصی مجرم و ظالم گویند].

**ئەڵێی گولی بەخیلە**: بە یەکێکی دڵ پیسی بەخیل ئەڵێن. *(خاڵ.پ.٤٩)* ف [به شخصی بدنهاد و حسود گفته می‌شود.]

**ئەڵێی گوو گێژی کردووە**: بە یەکێك ئەوترێ لە رووی سووکییەوە زۆر گێژ و وێژ بێ. *(خاڵ.پ.٥٠)* ف [برای رسوایی است و به شخص گیج و منگ گفته می‌شود.]

**ئەڵێی گووی خۆی گێرە ئەکا**: بە یەکێك ئەوترێ کە هەر بێت و بچێ بە بێهوودە. *(خاڵ.پ.٥٠)* ف[به کسی گفته می‌شود که بیهوده در رفت و آمد باشد.]

**ئەڵێی گوێز ئەکاتە هەمانە (هەوانە)**: بە یەکێکی تووڕە ئەوترێ کە بە رەقی قسە بکات لەگەڵ یەکێکی نەرم و لەسەرخۆ. *(خاڵ.پ.٥٠)* ف [به شخصی خشمگین گفته می‌شود که به شدت با شخصی آرام و متین برخورد کند.]

**ئەڵێی گوێزی بۆ ئەژمێرن**: بە یەکێك ئەوترێ کە هەرچەند ئامۆژگاری بکەیت وەری نەگرێ. *(خاڵ.پ.٥٠)* ف [به شخصی گفته می‌شود که هرچند او را نصیحت کنید گوش فرا ندهد.]

**ئەڵێی گوێزی ناو بێژنگە**: بە یەکێك ئەوترێ کە سەری لێ شێوا بێ، و هەردەمە لە شوێنێك بێ. یان کەسێك ئارامی لێ بڕابێ و بەردەوام لە هات و چوودا بێ. *(خاڵ.پ.٥٠)* ف[به شخصی پریشان و سرگردان گفته می‌شود که هر لحظه در جایی باشد.]

**ئەڵێی گوێزی ناو دەخیلەیە**: بە یەکێکی زۆر بچکۆلانە ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٥١)* ف [به شخصی بسیار کوچک گفته می‌شود.]

**ئەڵێی گیپەی جۆیە**: بە شتی قەبەی ناقۆڵا ئەڵێن. *(خاڵ.پ.٥١)* ف[به شخصی لندهور و ناهموار گفته می‌شود.]

**ئەڵێی گیسکی قەرزار نەگرتووە**: بە یەکێکی گەمژەی نابووتی بچکۆلانە ئەڵێن. *(خاڵ.پ.٥١)* ف[به کسی گیج و هالو و بدقیافه گفته می‌شود.]

**ئەڵێی عیسا گرتوویەتی و مووسا تێی ئاخنیوە**: بە یەکێك ئەوترێ کە لە قەڵەوی دا ڕەوییبێتەوە. *(خاڵ.پ.٤٧)* ف [به شخصی گفته می‌شود که از شدت چاقی آماس آورده باشد.]

**ئەڵێی فاتە سوورەوانە (سوورەبانە)**: ئەگێڕنەوە ژنێك بووە ناوی فاتەی سوورەبان

بووه ئەم ژنه شەڕی ناوەتەوه و خۆیشی سەیری کردووه کە لێشیان پرسیوه: ئەوه چییه؟ وتوویەتی: ئەڵێن شەڕ و هەرایە، قەباحەتی فاتەشی تیایه. ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە شەڕ بنێتەوه و خۆیشی سەیری بکا. *(خاڵ.پ.٤٧)* ف [روایت می‌کنند زنی بە اسم فاطمه سوره‌بان بوده است کە همیشه جنگ و آشوب به راه می‌انداخته و خود نظاره‌گر آن بوده است. وقتی از او می‌پرسند این جنگ و بلوا چیست؟ در جواب می‌گوید گویا جنگ و دعواست، بی‌آبرویی و رسوایی فاطمه هم در آن دخیل است. حال به کسی گفته می‌شود که جنگ و آشوب به پا کند و خود نیز به تماشای آن بنشیند.]

**ئەڵێی قەل و بەچکە قەلەکەن، تفیان کردووه دەم یەك:** بە دوو کەس ئەڵێن کە لە قسەیەکا هەردوکیان وەك یەك قسه بکەن بێ ئەوەی ئاگایان لێ بێ. یان دووکەس پشتیوانی لە قسەی یەکتر بکەن. *(خاڵ.پ.٤٧)* ف [به دو نفر می‌گویند که در مسئله‌ای مانند هم فکر کنند بدون اینکه از نظر هم آگاهی داشته باشند.]

**ئەڵێی کاسەی چەورە:** بە یەکێك ئەوترێ کە هیچ نەگرێتە خۆی. و گوێ بە قسەی کەس نەدا. *(خاڵ.پ.٤٨)* ف [به کسی گفته می‌شود که هیچ چیزی به گوشش فرو نمی‌رود و هیچ خواسته‌ای را برآورده نمی‌کند.]

**ئەڵێی کەری دەروێشە سەر بە هەموو ماڵێکا ئەکا:** ١) بە یەکێکی ناشیرینی دەم و قەپۆز چڵکن ئەوترێ. ٢) کەسێ کە، هێڵ و سنوور نەناسێ و لە زۆر شوێن و کاردا خۆی هەڵقورتێنێ. *(خاڵ.پ.٤٩)* ف [١) به کسی زشت چهره و سر و صورت کثیف گفته می‌شود. ٢) به کسی گفته می‌شود که هیچ حد و مرزی نشناسد و در هر کاری مداخله کند.]

**ئەڵێی کەشکی ئاوەسۆوە:** بە یەکێك بێشەرم ئەوترێ کە قسه کاری تێ نەکات. *(خاڵ.پ.٤٩)* ف[به کسی بیشرم گفته می‌شود که سخن در او کارگر نباشد.]

**ئەڵێی کەڵەشێری بلقاسمە:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە میانەی قسەی ئەم و ئەوا تێ هەڵکات. *(خاڵ.پ.٤٩)* ف [به کسی گفته می‌شود که در میان سخن دیگران بپرد و سر و صدا ایجاد کند و آواز سر دهد.]

**ئەڵێی کەڵەشێری سەربارەدارە:** بە یەکێکی بچووکی بێ نموود ئەوترێ کە هەمیشە خۆی دەرخسات. *(خاڵ.پ.٤٩)* ف [بە شخصی

کوچک و بی‌نمود گفته می‌شود که همیشه ابراز وجود نماید و به نوعی خود را نشان دهد.]

**ئـەڵێی کەڵەشـێری کلـك هەڵکێشـراوە:** وەك پێشوو.

**ئەڵێی کەندووی بەتاڵە:** بـە یـەکێکی بۆشـی بێ زانین و زانیاری ئەوترێ. یان قسەی زل بکا و لـە زانـین خـاڵی بـێ. *(خاڵ.پ.٤٩)* **ف** [بـە شخصی تهی مغز و بی علـم و دانـش یـا بـی عقل و اندیشه گفته می‌شود.]

**ئەڵێی کەندووی نـەزان کـردووە:** بـە یـەکێکی زلـی قەبـەی ناشـیرین ئـەوترێ. *(خاڵ.پ.٤٩)* **ف**[به شخصی لندهور و بی‌ریخت و قـواره گفته می‌شود.]

**ئەڵێی کڵاوی سـەخری جـنی لەسـەر دایـە:** بـە یەکێك ئـەوترێ کـە زۆر بزێـو بـێ و لـە هـیچ شـــوێنێك زۆر نەمێنێتـــەوە لەبـــەر ئـــەوە دۆزینەوەی بۆ یەکێك گران بێ. *(خاڵ.پ.٤٨)* **ف**[به شخصی بسیار زیرک گفته می‌شـود که در هیچ جـایی بسـیار نمانـد بـه همـین علت پیدا کردن آن بـرای دیگـران مشـکل باشد.]

**ئەڵێی کوردی دۆنەدیوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ شتێك تامـەزرۆ بـێ. *(خاڵ.پ.٤٨)* **ف** [بـە کسی گفته مـی‌شـود کـه آرزومنـد چیـزی باشد.]

**ئەڵێی کووپەی سەروینە:** بە مەردمی کـورتی خڕی تێکسمڕاو ئـەڵێن. *(خاڵ.پ.٤٩)* **ف** [بـه شخصی کوتاه قد و چاق و قوی بنیـه گفتـه می‌شود.]

**ئـەڵێی کـووزە کـەمتیاری پێیـە:** بـە یـەکێك ئەوترێ کە لای هـەموو کەسـێك خۆشەویسـت بـێ. *(خاڵ.پ.٤٨)* **ف** [بـه شخصـی گفتـه مـی‌شـود کـه پـیش همـه عزیـز و محبـوب باشد.]

**ئەڵێی کوێرە و ئەسپێی لە مشت کـەوتووە:** بـە یـەکێك ئـەوترێ کـە چـنگی بەسـەر شـتێکا گرتبێ، و بە ئامـان و زەمـان لـە ژێـر چـنگی نەیەتـە دەرەوە. *(خاڵ.پ.٤٩)* **ف** [بـه کسـی گفته مـی‌شـود کـه چیـزی را غصـب کـرده باشـد و بـه هـیچ وجـه از دسـتش بیـرون نیاید.]

**ئـەڵێی لۆتییـە و عەنتـەری تۆپیـوە:** بـە یـەکێکی خەفـەتبار ئـەوترێ. *(خاڵ.پ.٥٢٠)* **ف**[به کسی غمگین گفته می‌شود.]

**ئەڵێی لە بن دارێکایە گـەڵای پێـوە نیـە:** بـە یـەکێکی خەفـەتبار ئـەوترێ. *(خاڵ.پ.٥٢٠)* **ف**[به کسی غمگین گفته می‌شود.]

**ئـەڵێی لـە دەم گـورگ بـەربووە:** بـە یـەکێکی چڵێسـی نەوسنی بەهەڵپە ئـەڵێن لـە خواردنـا.

یان کەسێك، لە برسێتیدا بە پەلە پەلاماری نان خواردن بدا. (خاڵ.پ.٥٢) ف [به شخصی شکم‌پرست و گرسنه گفته می‌شود که در خوردن تعجیل داشته باشد.]

**ئەڵێی لە گەرووی مار دەرهاتووە:** واتە زۆر راست و دروستە. (خاڵ.پ.٥٢) ف [بسیار راست و درستکار است.]

**ئەڵێی لە گوێی گادا نووستووە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بێ ئاگا بێ لە دەنگ و باسێك. کەسێکە ئاگای لە دنیا نەبێ و هیچ تێ ناگا. (خاڵ.پ.٥٢) ف[به شخصی گفته می‌شود که از دنیا، واقعه یا رویدادی بی‌خبر باشد.]

**ئەڵێی لە کلاّ گەڕاوە:** بە یەکێکی لاری خوار و خێچی ناشیرین ئەوترێ. (خاڵ.پ.٥٢) ف [به شخصی کج و کوله، زشت و بدقیافه گفته می‌شود.]

**ئەڵێی لەسەر ئاگر دانیشتووە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بە ناچار لە شوێنێك دانیشتبێ. کەسێك بە پەلە بێ و لە شوێنێك نەتوانێ بمێنێتەوە. (خاڵ.پ.٥٢) ف [به کسی گفته می‌شود که به اجبار در جایی نشسته باشد.]

**ئەڵێی لەسەر بانی جەهەننەم لەوەڕیوە:** بە یەکێکی رەقوتەقی لاواز ئەوترێ. (خاڵ.پ.٤٣) ف[به کسی لاغر و ضعیف گفته می‌شود.]

**ئەڵێی لەسەر درك بەندە:** وەك پێشوو. کەسێکی نائارام بێ. (خاڵ.پ.٤٣) ف[شخص عجول و بی‌آرام و قرار.]

**ئەڵێی مامۆستایە:** بە یەکێکی لێزان و زرنگ لە کارێك ئەڵێن. ف [به کسی کاردان و خبره و زرنگ گویند که در کاری یا شغلی کارایی دارد و کارشناس است].

**ئەڵێی مەشکە تاڵ ئەدا:** بە یەکێك ئەوترێ کە جنێوێکی زۆر بدا بە یەکێك و بە جنێو بێئاخنێ و تاڵی بدا. (خاڵ.پ.٥٤) ف [به کسی گفته می‌شود که به فحش و ناسزای بسیار دیگران را آزار و رنج دهد.]

**ئەڵێی مژ لە قنگی کەر ئەدا:** بە یەکێك ئەوترێ کە مژی قایم بدا لە سەبیل و قلیان. (خاڵ.پ.٥٣) ف [به کسی که پک محکم به سیگار یا قلیان می‌زند گویند.]

**ئەڵێی مریشکە و لە گووی خۆی چینە ئەکا:** ١) بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی لێ ون بووبێ، و بە راست و چەپی خۆیا دەست بگێڕێ. ٢) بە کەسێکی رژدی پیس خۆریش ئەڵێن. (خاڵ.پ.٥٣) ف [١) کسی که چیزی را گم کرده و راست و چپ بدنبالش می-گردد. ٢) به کسی خسیس گویند.]

**ئەڵێی مریشکی ئاشەوانە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بە سەر ئەم و ئەوەوە بلەوەڕێ. (خاڵ.پ.٥٣)

ف[به کسی گفته می‌شود که سربار دیگران باشد و از آنها تغذیه کند.]

**ئەڵێی مریشکی ئاشەوانە، تا کشەی لێ بکەیت زیاتر بۆ سەر دۆڵیان رائەکات:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە خوارەوە جێگای نەبێتەوە بۆ بەرەوژوورتر هەوڵ بدات. *(خاڵ.پ.٥٢٠)* ف [به کسی گفته می‌شود که در پست‌های پایین‌تر راهش ندهند ولی او در جهت رسیدن به پست‌های بالاتر باشد.]

**ئەڵێی مریشکی ئاوەڕووتکراوە:** بە یەکێکی رووتی کەم بەرگ و کاڵا ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٥٢٠)* ف [به شخصی برهنه و بدون لباس گفته می‌شود.]

**ئەڵێی مشتەی ناو هەمانەیە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زبان و دەمی بە نهێنی لە کارا بێ. *(خاڵ.پ.٥٣)* ف [به کسی گفته می‌شود که مخفیانه زبانش در کار باشد.]

**ئەڵێی مشکی جواڵدڕە:** ١) بە یەکێکی بزێوی دڕ ئەوترێ. ٢) کەسێك لەبنەوە کاری خۆی کرد بێ. *(خاڵ.پ.٥٣)* ف [١) به کسی ناآرام و نترس و موذی گفته می‌شود. ٢) کسی که کار خود را اساسی انجام داده باشد.]

**ئەڵێی مشکی سەرتەختەیە:** بە یەکێکی بچکۆلانەی جرپنی جەربەزە ئەوترێ. *(خاڵ.پ.٥٣)* ف [به شخصی کوچک و بازیگوش و ناآرام گفته می‌شود.]

**ئەڵێی مشکی ناوجەواڵە:** ١) بە یەکێکی بچووك ئەوترێ کە بەرگی یەکێکی لە خۆی گەورەتر لەبەر کردبێ. ٢) بە کەسێکی گیان سەختیش ئەڵێن کە زۆر سەرسەخت بێ و گیان نەدا بەدەستەوە. *(خاڵ.پ.٥٣)* ف [١) به شخصی کوتاەقد گفته می‌شود که لباس کسی از خود بزرگتر را پوشیده باشد. ٢) به کسی جان سخت و مقاوم گویند.]

**ئەڵێی من کرم ئەکەم و ئەو ئەیخوا:** بە یەکێك ئەڵێیت کە حەز لە چارەی نەکەیت. *(خاڵ.پ.٥٣)* ف [به کسی گفته می‌شود میلی به دیدارش نداشته باشید و از او نفرت داشته باشید.]

**ئەڵێی موویان هەڵکرووزاندووە (هەڵکزاندووە):** بە یەکێك ئەڵێن لە کاتێکا نەتەوێ بێت، کەچی ئەو لەو کاتەدا کوتوپڕ پەیدا بێ. *(خاڵ.پ.٥٤)* ف[به کسی گفته می‌شود در موقعی که نخواهید او را ببینی ولی او در همان لحظه ناگهان پیدا شود.]

**ئەڵێی مێزی گایە، هەر لار ئەڕوا:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە هەموو شتێکا لار بێ. *(خاڵ.پ.٥٤)* ف [به کسی گفته می‌شود که در تمام مسائل و اعمالش کج‌اندیش باشد.]

**ئەڵێی مێشێ میوانی نییە:** بە یەکێك ئەوترێ

کە شتێکی بەسەر هاتبێ و باکی نەبێ. (خاڵ.پ.٥٤) **ف** [بە کسی گفته می‌شود کە دچار حادثه یا واقعه‌ای شده باشد و ترس و واهمه‌ای هم نداشته باشد.]

**ئەڵێی مێچی قومارخانەیە:** بە یەکێکی فێڵباز ئەوترێ. (خاڵ.پ.٥٤) **ف** [بە کسی مکار و نیرنگ‌باز گفته می‌شود.]

**ئەڵێی نانی بەسەر ساجەوە سووتاوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر هار و هاج بێ. (خاڵ.پ.٥٤) **ف**[بە کسی ناآرام و بازیگوش گفته می‌شود.]

**ئەڵێی نانی بێ خوێیە:** بە یەکێکی بەدبەخت، بێ شانس ئەڵێن. **ف** [بە انسانی بدبخت و بی‌شانس و اقبال گویند].

**ئەڵێی نە بای دیوە و نە باران (بۆران):** بە یەکێك ئەوترێ کە لەسەر کارێك سزایەکی سەخت درابێ، کەچی لە دوای سزاکە دەست بکاتەوە بە کارەکە. (خاڵ.پ.٥٥) **ف** [کسی کە اصلاً در بند مجازات و بدکاری‌هایش نیست.]

**ئەڵێی نە نان ئەخوا و نە ئاو:** بە یەکێکی زۆر لەڕ و لاواز ئەوترێ. (خاڵ.پ.٥٥) **ف** [بە شخصی بسیار لاغر گفته می‌شود.]

**ئەڵێی نیسکە بەر و پشتی بۆ نییە:** بە یەکێکی دووڕوو ئەوترێ. (خاڵ.پ.٥٥) **ف** [بە شخصی منافق گفته می‌شود.]

**ئەڵێی ورچی دەست شکاوە هەر بۆڵەبۆڵێتی:** بە یەکێك ئەوترێ کە لەبەر خۆیەوە هەر خوتەو بۆڵەی بێ. (خاڵ.پ.٥٢٠) **ف** [بە کسی گفته می‌شود کە پیش خود غرولند کند.]

**ئەیژی (دەڵێی) رۆن داخ ئەکا:** [بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی بۆ کارێك چاك ئامادە بکا.] **ف** بە کسی گفته می‌شود کە خود را برای کاری آمادە کند. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٨)

**ئەیژی (دەڵێی) گوێزێکن و کریاونەتە دوو کوتەوە:** [بە دوو کەس دەڵێن کە زۆر لەیەك بچن.] **ف** بە دو شخص گفته می‌شود کە بسیار بهم شبیه باشند. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٨)

**ئەیژی (دەڵێی) کاروانسەراس:** [بە شوێنێك دەوترێ کە زۆر قەرەباڵغ بێت. خەڵکێکی زۆری بێ‌شومار و بێ‌شیرازەی تیادا بێت و بچێ.] **ف** بە جایی شلوغ گفته می‌شود کە جمعیت بسیاری در آن رفت و آمد کنند. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٨)

**ئەیژی (دەڵێی) کێوی (کێفی) کەندووە:** [بە یەکێك ئەڵێن کە خۆی زۆر ماندوو و شەکەت نیشان بدا. **ف** بە کسی گفته می‌شود کە خود را بسیار خسته نشان دهد.]

**ئەیژی باڕووتە:** [مرۆڤی کەللەڕەق کە زوو

تووڕە دەبێ و هەڵدەچێ. **ف** به انسانی عصبانی و بسیار خشمناک گویند که نمی‌شود با او صحبت کرد، مثل باروت منفجر می‌شود].

**ئەیژی قیامەت هەستاوە:** ١) خەڵکی زۆر کۆبوونەوە لە شوێنێك ٢) رۆژگاری ناخۆش و پڕ لە شەڕ و ئاژاوە کە کەس ئاگای لە کەس نەمێنێ و هەر کەس هەوڵی خۆی بدات. *(عەبدولوەهاب.١٩٣)* **ف** [١) به جمعی بسیار که در جایی جمع شوند گویند. ٢) به روزگاری نامناسب پر از جنگ و آشوب گفته می‌شود که کسی از کسی خبر ندارد و هر که به فکر نجات خویش است].

**ئەیژی کوچك (بەرد) دەخاتە نێو گۆم:** بە یەکێکی نەزان و لە قسە تێنەگەیشتوو ئەڵێن. **ف** به شخصی نادان و نفهم گویند.

**ئەیژی مار و سیرن ـ مار و پونگەن:** دوژمنایەتی دایمی بێبڕانەوە نێوان دوو دوژمن یا دوو شت کە هەرگیز کۆ نەبنەوە. **ف** دشمنی مدام و همیشگی میان دو چیز یا دو کس.

**ئەیژی ماری سڕە:** بە زۆردارێکی لێکەوتوو ئەڵێن. *(عەبدولوەهاب.٢٣٨)* **ف** [به ظالمی شکست‌خورده گویند].

**ئەیژی مناڵ نەخەڵەتێنی:** [ئەیەوێ فریومان بدات و کڵاو بنێتە سەرمان]. **ف** می‌خواهد فریبمان دهد. *(حیرت.٥٤٨)*

**ئەیژیتە ئارد گەنم بەهارەس:** واتە هەموو شتێکی لێ دێت. **ف** [چیزی یا کسی که به درد همه چیز می‌خورد.]

**ئەیژیتە ئاو هاوردگیە (هێناویە):** [بە یەکێك ئەڵێن کە لە خۆڕایی و بێحەساو خەرج بکا.] **ف** ولخرجی کسی را چنین بیان می‌کنند. *(حیرت.٤٥)*

**ئەیژیتە پا بە سەر منا نەنی:** [بە یەکێك ئەڵێن کە زۆر بە ئەسپایی هەنگاو هەڵگرێ.] **ف** به کسی که خیلی آهسته راه می‌رود گویند. *(حیرت.٤٥)*

**ئەیژیتە دەردەچە پەڵەیە:** [بە کەسێکی دەردەدار و لەڕ و لاواز دەڵێن.] **ف** به شخصی رنجور و ضعیف‌الحال گویند. *(حیرت.٤٥)*

**ئەیژیتە دەڵ چەکانگیە:** [بە ژنێکی فرەخۆر و سکەڕوو دەڵێن]. **ف** در مورد زنی پرخور گفته می‌شود. *(حیرت.٤٥)*

**ئەیژیتە رۆسەم زاڵی بووگە (بووە):** [بە ژنێك ئەڵێن کە کچی بووبێت و دوای زایینەکەی درەنگ بە ئیش و کار بکات، خەسووی بە تانە و تەشەرەوە وای پێ دەڵێت.] **ف** به زنی

که دختر زاییده یا پس از زایمان دیر از بستر برخیزد. مادرشوهر با طعنه چنین گوید. (حیرت.٤٦)

**ئەیژیتە سەرگەردەنەس:** [بە دایەرەیێك ئیدارەیەکی حکوومەتی ئەڵێن کە هەموو موچەخۆرەکانی بەرتیل خۆر بن.] **ف** ١) بە ادارەای گفته می‌شود که کارمندانش رشوه بگیرند. ٢) به کاسبکاری یا فروشنده‌ای گویند که اجناسش را گران بفروشد. (حیرت.٤٦)

**ئەیژیتە سێفێکن و کراونەتەوە دوو لەتەوە:** [بە دوو کەس ئەڵێن کە زۆر لەیەك بچن.] **ف** به دو نفر گویند که شبیه بهم باشند. (حیرت.٤٦)

**ئەیژیتە گەونە:** [بە مووی زبر و گژیاگ ئەڵێن.] **ف** موهایی زبر و درشت و شاخ کرده. (حیرت.٤٧)

**ئەیژیتە قاترە:** [لە رێگەوچووندا وەك قاترە. لار و ناڕاست.] **ف** در راه رفتن مانند قاطر است. (حیرت.٤٦)

**ئەیژیتە کەڵەشێر ناوەختە:** [بە کەسێك ئەڵێن کە ناوەخت و بێجێگە دەست بە قسەکردن بکا.] **ف** به کسی گفته می‌شود که بی‌موقع و بی‌ربط شروع به سخن گفتن کند. (حیرت.٤٧)

**ئێژی ئاسیاوێکە ئاوی کەفتگە (کەوتووە):** بە جێگایەکی بێدەنگ و کش و مات ئەوترێ. (رخزادی.٥٠) **ف** [به جای ساکت و بی‌صدا گفته می‌شود.]

**ئێژی ئاگر ها لە دەمیا:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر توند و بەپەلە قسە بکا. (رخزادی.٥٠) **ف**[به کسی گفته می‌شود که بسیار تند و عجولانه صحبت می‌کند.]

**ئێژی ئاڵەتیان تێکردگە (کردووە):** بە یەکێك ئەوترێ کە ئارام و قەراری نەبێ. (رخزادی.٥٠) **ف**[به کسی گفته می‌شود که آرام و قرار نداشته باشد.]

**ئێژی ئەنەون لە مووی بەری!:** بە یەکێکی تووڕە و ئاڵۆز ئەوترێ. (رخزادی.٥٠) **ف** [به شخصی خشمگین و ناهنجار گفته می‌شود.]

**ئێژی بۆ ئاگر هاتگە (هاتووە):** بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ کارێ هاتبێ و بۆ گەڕانەوەیش زۆر پەلەی بێ. (رخزادی.٥٠) **ف** [به شخصی گفته می‌شود که راجع به امری یا کاری آمده باشد و در برگشتن تعجیل داشته باشد.]

**ئێژی بە دەم داینیاگە (داینــاوە):** بە منداڵێ ئەوترێ کە زۆر لە باوك و دایکی بچێ.

(رخزادی.٥١) **ف**[به بچه‌ای گفته می‌شود که بسیار شبیه به پدر و مادرش باشد.]

**ئێژی به دوو نق و نیم کردگیه سی:** به یەکێك ئەوترێ کە منالّی کەسێکی تری زۆر خۆش گەرەك بێ و بە زکی خۆیەوەی بلکێنێ. (رخزادی.٥٠) **ف** [به شخصی گفته می‌شود که بچه‌ی کس دیگری را دوست داشته باشد و او را به سینه‌ی خویش بفشارد.]

**ئێژی بەرد ئەداتە مل بەردا:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بە تووڕەیی یان بە پەلە قسە بکا. (رخزادی.٥١) **ف** [به کسی بسیار خشمگین گفته می‌شود که عجولانه صحبت کند.]

**ئێژی بەچەخوەرە ها لە زکیا:** بە یەکێکی زۆرخۆر ئەوترێ کە هەر لە تێربوون نەبێ. (رخزادی.٥٠) **ف**[به شخصی پرخور گفته می‌شود که هرگز سیر نشود.]

**ئێژی تازە لەدایك بووە:** رابردووی لە بیر بردووەو و ژیانێکی باشی دەست پێ کردووە. **ف**گذشته‌ها را کنار نهاده و زندگی تازه و خوبی را آغاز کرده است.

**ئێژی تفیان کردگەسە دەم یەك:** بە دووکەس ئەوترێ کە لە بابەتێکدا، هەروەکوو یەك قسە بکەن. (رخزادی.٥١) **ف** [به دو نفر گفته می‌شود که دربارهٔ موضوعی از قبل به توافق رسیده و نظرشان یکی باشد.]

**ئێژی تیکە گیریاگەسە قوڕگی:** ١) کەسێکی قسەنەکەرو بێ‌لایەن یان بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بە تاسەی دیتنی کەسێکی‌تر بێ. (رخزادی.٥١) **ف** [به کسی گفته می‌شود که بسیار آرزومند و مشتاق دیدار کسی دیگر باشد.]

**ئێژی تینگ بەر ئاوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بە تاسەی دیتنی کەسێکی‌تر بێ. (رخزادی.٥٢) **ف**[به کسی گفته می‌شود که بسیار آرزومند و مشتاق دیدار کسی دیگر باشد.]

**ئێژی جنۆکە گۆچی کردگە:** بە منالێکی تازە پەیدابووی لەڕ و لاواز ئەوترێ. (رخزادی.٥٢) **ف**[به نوزادی لاغر و ضعیف گفته می‌شود.]

**ئێژی رۆن قازیان لێ داگە (داوە):** بە یەکێکی بەدەماخ و دڵخۆش ئەوترێ. (رخزادی.٥٢) **ف**[به شخصی شاد و سرحال گفته می‌شود.]

**ئێژی سەگ هارە:** بە یەکێکی بێ‌حەیا ئەوترێ. (رخزادی.٥٣) **ف** [به شخصی بی حیا و شرم گفته می‌شود.]

**ئێژی سەوەتەی پەت بڕاوە:** ١) بە یەکێکی تەنیاکەوتوو ئەوترێ یان زۆر خاوخلیچك بێ.

٢) بە کەسێکەی بێکەڵك و کار ئەوترێ کە هیچی لە دەست نەیەت. (رخزادی.٥٣) ف [١) بە شخصی تک و تنهایا فردی شل و ول و بی‌خاصیت گفته می‌شود. ٢) بە شخصی بی‌فایده گفته می‌شود که هیچی از دستش برنمی‌آید.]

**ئێژی شەقول قەمەری کردگە (کردووە):** وا ئەزانی کارێکی زۆر گرینگی کردووە. (رخزادی.٥٣) ف[تصور می‌کند که کار مهمی را انجام داده است.]

**ئێژی گۆچانی قووت داگە (داوە):** بە یەکێکی فیزن ئەوترێ کە رەق و تەق بڕوا. (رخزادی.٥٥) ف [بە شخصی متکبر و خودخواه گفته می‌شود که راست و محکم راه برود.]

**ئێژی گورپەی گیپەخانەس:** بە یەکێکی زۆر چاخ و قەڵەو ئەوترێ. (رخزادی.٥٥) ف [بە کسی بسیار چاق و تنومند گفته می‌شود.]

**ئێژی گیاوڕەی خواردووە:** بە یەکێك ئەوترێ لە ناکاو بمرێ. (رخزادی.٥٦) ف[بە کسی گفته می‌شود که ناگهانی بمیرد.]

**ئێژی کاسەی قەرەچی (کەولی) ئاو بردگیەسی:** بە جێگایەکی زۆر قەرەباڵغ ئەوترێ. (رخزادی.٥٤)ف [بە جایی بسیار شلوغ و پرجمعیت گفته می‌شود.]

**ئێژی کەنیشکە جافیان بۆ داوە زانگە (داوەزاندووە):** بە یەکێك ئەوترێ کە هەر لە ئێوارەوە بخزێتە ماڵەوە. (رخزادی.٥٥) ف[بە شخصی گفته می‌شود که همیشه قبل از موعد مقرر بە خانه برگردد.]

**ئێژی لۆتییە و مەیموونەکەی تۆپیگە:** بە کەسێکی دەمهەراش، بەڵام خەمبار ئەوترێ کە ئێستا لە قسە کەوتبێ. (رخزادی.٥٦) ف[بە شخصی زبان‌دراز و غمگین گفته می‌شود که در حال حاضر از سخن گفتن افتاده باشد.]

**ئێژی لە دەم ڕەش بەربووگە:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە خواردنا هەوڵ و دەسەپاچە بێ. (رخزادی.٥٦) ف[بە شخصی گفته می‌شود که در خوردن عجول و سراسیمه باشد.]

**ئێژی لە گەل جێ ماوە:** واتە زۆر پەلەیەتی. (رخزادی.٥٧) ف [بسیار عجله می کند.]

**ئێژی لە قاتی ساڵیو هاتگە (هاتووە):** بە یەکێکی هەوڵخۆر یا کەسێکی لەڕ و لاواز ئەوترێ. (رخزادی.٥٦) ف[بە شخصی عجول و لاغر و مردنی گفته می‌شود.]

**ئێژی لە لووت فیڵ داکەفتگە (داکەوتووە):** واتە زۆر لەخۆرازی و قوڵم و لووت بەرز و فیزن. (رخزادی.٥٧) ف [بسیار متکبر و ازخودراضی است.]

**ئێژی ماڵی دزیاگە ـ بریاگە (براوە):** بە

یەکێکی فزوول ئەوترێ کە سەر بە هەر جێگایەك بکا بۆ ئەوەی سەر لە شتێ دەربێنێ. *(رخزادی.٥٧)* **ف**[به انسانی فضول گفته می‌شود که به هر جایی سر بکشد تا سر از کار دیگران دربیاورد.]

**ئێژی مامره و نانی کەفتگەسە کولانجا:** بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ هەر جێگەیە سەر بکێشێ. *(رخزادی.٥٧)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که به هر جایی سر بکشد.]

**ئێژی مرۆچەی خواردگە (خواردووە):** بە یەکێك ئەوترێ کە بای زکی خۆی پێ ڕاگیر نەکرێ. *(رخزادی.٥٨)* **ف**[به کسی گفته می‌شود که نتواند باد شکم خود را نگهدارد.]

**ئێژی مردگە و بەش زینگ نەخوا:** بە یەکێکی تەمەڵ ئەوترێ کە بۆ ژیانی خۆی هەوڵ نەدا و لە دەسڕەنجی خەڵك بژی. *(رخزادی.٥٧)* **ف**[به انسانی تنبل گفته می‌شود که برای زندگی خویش نکوشد و از دسترنج دیگران استفاده کند.]

**ئێژی مووساییەکەی زرێوارە:** بە یەکێك ئەوترێ کە دوای ئەوەی خەتەر بەسەرچووبێ، لە خەتەرەکە تێبگا و بترسێ، ترسنۆك. *(رخزادی.٥٨)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که پس از رفع خطر آگاه شود و بترسد.]

**ئێژی مێش نەیگەستگە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بەلایەك رووی لێ دابێ، بەڵام ئەو نەیخاتە خۆی. *(رخزادی.٥٨)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که بلایی یا رویدادی بر او واقع شده باشد ولی او به روی خویش نیاورد.]

**ئێژی نان ساجییە:** بە یەکێکی رێك و پێك و جوان ئەوترێ. *(رخزادی.٥٨)* **ف** [به شخصی مرتب و زیبا گفته می‌شود.]

**ئێژی وەوییە و ئەسپیان بۆ زین کردگە (کردووە):** بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی بۆ کارێ حازر کردبێ بەڵام هیچ پێویستێك بەو نەبێ. *(رخزادی.٥٩)* **ف**[به کسی گفته می‌شود که خود را برای کاری آماده کرده باشد و در عین حال هیچ نیازی هم به وجود او نباشد.]

**ئێژی هێلکە دووزەردێنەی بۆم کردگە (کردووە):** ئێژی کارێکی زۆر گرینگی کردووە. *(رخزادی.٥٩)* **ف** [گویی کار مهمی را انجام داده است.]

**بۆتە ئیشکەلی دارەبەنی:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر لەڕ و لاواز بوویێت. **ف** [فوق‌العاده لاغر شده باشد.]

**بۆتە بابی کرمانجی:** بە یەکێك ئەڵێن کە منداڵەکانی پشتیوان و یاریدەری نەبن وێڵیان کردبێ و هەڵیانخڕاندووە گەدایی بکات.

ف[به کسی گفته می‌شود که مورد حمایت فرزندانش نیست و او را رها کرده‌انـد، یـا به گدایی وادارش نموده باشند.]

**بۆتـە برێشکە**:زۆر لەبـەر هـەتاو بـووە رەش داگـەڕاوە (جـلال محـمود بـەرگی ۲ . ۳۰۰) ف [بسیار جلوی آفتاب بوده سیاه سوخته شده است.]

**بۆتـە تیـزە جـاڕی منـدالاَن:** ۱) بوودەڵەیـە و کەسێتی نزمە. هەرچی بێت تیزی پێـوە دەکـا گاڵتە جاری هەموانە تا هـی منـدالاَنیش ۲) باری کەوتووە و نەهامەتیەتی رووتـی کـردووە (جلال محمود بەرگی ۲ . ۳۰۰) ف [تنبـل اسـت و شخصـیت پسـتی دارد، همـه مسـخره‌اش می‌کنند حتی بچه‌هـا هـم ۲) تـوی بـدبختی افتاده و بدشانسی به او روی آورده است.]

**بۆتە پەندی عالەمێ:** [هەموو لە بەسەرهاتی ئـەو تێگـەییون و ئاگاییـان پەیـدا کـردووە و پەندیان وەرگرتووە.] ف همه از سرگذشـت او خبردار شده و پند و عبـرت گرفتـه‌انـد. (فتاحی قاضي بەرگی۲ .۳٦)

**بۆتە پووشی بـەر رۆژێ:** [سـووك و تـرۆی نـاو کۆمەڵ بووە و خەڵك رێزی بۆ دانانن.] ف در میان جامعه رسوا و بی‌آبرو شده و مردم به او احترام نمی‌گذارند. (فتاحی قاضي بەرگی۲ .۳٦)

**بۆتـە خـدری خـدران:** [بەسـەر کەسـانی‌تـردا سەرکەوتووە]. ف بر دیگران تفوق و برتری یافته است. (فتاحی قاضي بەرگی۲ .۳۷)

**بۆتە گورگ:** ۱) ناشیرین بوو ۲) ترسناك بووە و شەڕی لـێ دەبێتەوە، سامی پەیـدا کـردووە، نەهێنبڕە. (جلال محمود بەرگی۲ . ۳۰۰) ف [ ۱) زشت شـده ۲) ترسـناک شـده و جنـگ و آشوب به پا می‌کنـد، هیبـت پیـدا کـرده و کینه‌توز شده است.]

**بۆتە قەلەگووخۆر:** [بێ‌جێگە خۆی دەکوتێتـە نێو کاروباری خـەڵك. کەسـایەتی نـزم بـووە و سووکی ناو کۆمەڵە!]. ف در کـار دیگـران دخالت و اظهارنظر بیجا می‌کند که حقـش نیست. شخصی پست و بی‌آبروست. (فتاحی قاضي بەرگی۲ .۳۷)

**بۆتە کەر بازاڕی:** [نەبوونی یاسا و دەسـەلاَتی میری]. ف قاعده و قانونی در میـان نیسـت. عدم حکومت قـانون. (فتاحی قاضي بەرگی۲ .۳۷)

**بۆتـە کـەری ئـاوایی (بێگـاران)**:بـە یـەکێك دەوترێ کە هەرچـی بێـت، کـارخۆی بەسـەردا بدات. بیچەوسێنێتەوە و نقەش نەکات. (جلال محمود بەرگی۲ . ۳۰۰) ف [بـه کسـی گفتـه می‌شود که هرکسـی کـه کـار خـود را بـه وسیله او انجام می‌دهد بی‌مـزد و پـاداش او

را بـه رنـج و زحمـت وادار مـی‌کننـد و صدایش هم بیرون نمی‌آید.]

**بۆتە منداڵ بـازاڕیی:** بە کارێـك دەوترێـت کـە منداڵان دەسـتیان تێوەردابێـت، چەواشـە بـوو بێت، گەورە لاکـەوتبێت. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٣١٠)* ف [به کـاری گفتـه مـی‌شـود کـه بچه‌ها در ان دخالت کرده باشند و برعکس بزرگان را کنار زده باشند.]

**بۆتە وشتری نێـو پـەمۆ:** [بـوونی بـێ بایـەخ و پووچە و ئازاردەر]. ف وجودی بـی‌حاصـل و عاطـل و باطـل و در نتیجـه مضـر. *(فتـاحی قاضی بەرگی٢ .٣٧)*

**باڵۆلـە:** زانـا و تێگەیشـتوو یـان گێلۆکەیـە. *(عەبدولوەهاب.٤٤)* ف [آگاه و فهمیده یا ابلـه و نادان].

**بەحرە ـ دەریایە (زەریایە):** ١) بە مـرۆی بـە پشوو و لەسەرخۆ ئەڵێن. کەسێك کـە درەنـگ هەڵچێ و توورە بێ. ٢) بە یەکێك ئـەڵێن کـە لە کردە و کارێکا زانـا بێـت. ٣) شـوێنی زۆر گـــەورە و قـــەرەباڵغ (ســـنە بـــەحرە) *(عەبدولوەهاب.٤٩)* ف[١) بـه انسـانی آرام و متین گویند. ٢) به شخصی کـه در کـاری و فعالیتی تخصص داشـته باشـد. ٣) بـه جـایی بسیار شلوغ گویند].

**بەچکەسەگێکە:** بە منـداڵی هاروهـاج ئـەڵێن. *(عەبدولوەهاب.٤٨)* ف [بـه بچـه‌ای شـلوغ و ناآرام و بازیگوش گویند].

**بەچکەشێرە:** بە یەکێك ئەڵێن کـە لـە نـەوەی ئازا و پاڵەوانان بێ. *(عەبدولوەهاب.٤٨)* ف [به کسی شـجاع گوینـد کـه از نـژاد پهلوانـان باشـد].

**بەچـکەمارێکە:** [زۆرداری بچـووك ف بــه ظالمی کوچک گویند].

**بوو بـە ـ بۆتـە ـ ئـاردی نـاو دڕکـان:** پـەرش و بڵاوبۆتـــەوە وکـــۆ کردنـــەوەی ئەســـتەمە. بـــە بنەماڵەی دابڕاوو، لێك جـوداکراویش ئـەڵێن. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٢)* ف [پخـش و پـلا شــده و جمــع‌آوری آن مشــکل اسـت. بـه خانواده‌ای از هم جداشده هم گویند.]

**بوو بە ـ بۆتە ـ ئەستێرەی سیوەیل:** بە یـەکێك ئەڵێن کە کەم‌کەم خۆی دەرئەخات. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٣)* ف [به شخصی گفتـه مـی‌شـود که کمتر در انظار عموم ظاهر شود.]

**بوو بە ـ بۆتە ـ داسك و دەرزی:** زۆر لاواز بووە، بە ئەندازەیەك پێستی بە سەر ئێسکیدا وشـك بۆتەوە. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٣)* ف [بسیار لاغـر شـده، بـه طـوری کـه پوسـتش بـر استخوانش چسبیده و خشک شده است.]

**بوو بە ـ بۆتـە ـ کـۆلارە ـ فڕفڕۆکـە ـ تـەیارە:** خێـرا دەڕوات، وەك بفڕێـت. تیـژ هەڵیـەت

وڕادەکات. (جلال محمود بەرگی١. ٩٣) ف [سریع می‌رود، مثل این‌که پرواز کند. با عجله فرار می‌کند.]

**بوو بە ـ بۆتە ـ مووی لووت:** بە یەکێك دەڵێن کە بەرچاو بگرێت یان حەز لە چارەی نەکرێت، لای ئەو کەسە ڕەزای تاڵ بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٩٣) ف [به کسی گفته می‌شود که مزاحم و مانع باشد و میلی به دیدارش نداشته و او را دوست نداشته باشید.]

**بوو بە ئاگر و چۆتە گیانی:** ١) چۆتە بن کلێشەیە و تێزە و تێزەی دەدات، هانی دەدات وازی لێ ناهێنێ ٢) ئەو بیرە، ئەو خولیایەی چۆتە کەللەیەوە سرەوتی لەبەر بڕیوە ٣) تێ پەڕیووە لێی دەدات، سزای دەدات. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [١) به درونش رفته و وسوسه و تحریکش می‌کند ٢) آن فکر به مغزش فرو رفته و آرام و قرار را از او گرفته است. ٣) به او حمله کرده و سزایش می‌دهد.

**بوو بە ئاو (تنۆکێ) ئاو:** ١) تەریق بووە. ٢) بە خۆیدا شکایەوە، شەرمی کرد. (جلال محمود بەرگی١. ٩١) ف [١) شرمسار شده است.] [٢) از خود خجل و شرمنده شد.]

**بوو بە ئاو چووگە بە زەویدا:** تەریق و پەشیمان بووەوە. دەڵێن: لە شەرمەزاریدا بوو بە تنوکێ ئاو و بەزەویدا چوو. (جلال محمود بەرگی٢. ٣٢) ف [شرمنده و پریشان شده است. گویند در شرمساری تبدیل به یک قطره آب شده است.]

**بوو بە بلەی هەژدە گێ:** گێ= (کراس) بە یەکێ دەوترێ کە بەشی خۆی دانەکەوێ. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [به کسی گویند که به سهم خویش قانع نباشد.]

**بوو بە پەڕۆی بۆسۆ:** واتە ناوی زڕا. ناوی بە خراپ دەرچوو. (جلال محمود بەرگی١. ٩١) ف [رسوا و بی‌آبرو شده است.]

**بوو بە پووش برنج:** لە بەرچاوی خەڵك سووك و ریسوا بووە. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [در نظر مردم بی‌آبرو و رسوا شده است.]

**بوو بە خوڵی بەرپێی:** سەری بۆ شۆڕ کرد و، بچووکی و کۆیلەیەتیی خۆی بۆ نواند. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [در برابرش تعظیم کرد و بندگی خود را به او نشان داد.]

**بوو بە خوێنی سیاوەحش:** کوشتنی سیاوەحش کە کوڕی کەیکاوسی دووەمە کە شای کەیانیەکان بووە لە ئێراندا بە دەستی ئەفراسیابی شای تورکستان بوو بە هۆی ڕشتنی خوێنێکی زۆر. واتە: ئەم ئاژاوەیە، ئەم ناکۆکییە، ئەم قسەیە هەر کۆتایی نەهات؟! (جلال محمود بەرگی١. ٩١) ف [کشته

شدن سیاوش پسر کیکاوس دوم پادشاه کیانیان به دست افراسیاب پادشاه توران موجب کشت و کشتار و خونریزی بسیاری میان ایرانیان و تورانیان شد و این آشوب و دشمنی میان این دو کشور هیچوقت به پایان نرسید.؟؟!]

**بوو بە داڵی گەڕ:** بە مرۆڤێکی لاواز و لەڕ دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٣٢)* ف [به انسانی لاغر و ضعیف گفته می‌شود.]

**بوو بە دەمی مردوو:** واتە خۆراك یان چایەکەت سارد بووەتەوە. (چایەکەت بوو بە دەمی مردوو). ف یعنی غذا یا چایی‌ات سرد شد.

**بوو بە ریشیەوە:** لەو کارەوە گلاوە. ئەو کارە، ئەو شتە، ئەو کەسە بوو بە تووشیەوە. *(جلال محمود بەرگی ١ . ٩١)* ف [آلوده و گرفتار آن کار یا آن چیز یا آن کس شده است.]

**بوو بە سووکەی بەرقەفەز:** سووکەپەڕی وردی باڵندەیەکە لێی هەڵدەوەریت واتە لە کۆمەڵدا سووك بووە. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٢٩)* ف [سووکە: کوچکترین پری است که از پرنده کنده می‌شود، در میان جامعه بی‌آبرو و رسوا شده است.]

**بوو بە شێخی شەو لێ گۆڕاو:** لە رووی رێزەوە بە یەکێك دەوترێ کە وەختی لێ تێك چووبێت. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٢٩)* ف [از روی احترام به کسی گفته می‌شود که اوقاتش آشفته و پریشان شده باشد.]

**بوو بە گای هۆڵە (گێرە) شێون:** بەو کەسە دەکوترێ کە ئاژاوە و پشێوی و دووبەرەکیی بەرپا دەکات. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٣٢)* ف [به کسی گفته می‌شود که آشوب و پریشانی و تفرقه ایجاد می‌کند.]

**بوو بە گووی مەلەوان:** بە شتێك ئەوترێ کە پەرش و بڵاو ببێتەوە. *(خاڵ.پ.٩٨)* ف [به چیزی گفته می‌شود که پخش و پلا شده باشد.]

**بوو بە عەباکەی مام رێوی:** بە گفتێك دەوتری کە بۆ دەسخەڕۆ کردن و فریودان درۆزنێك دابێتی. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٢٩)* ف [به قولی گفته می‌شود که دروغگویی برای فریب دادن دیگران داده باشد.]

**بوو بە کەڵەشێری زەماوند:** بە یەکێك دەوترێ کە بۆ هەر کوێیە بڕوات قاوی دەن و دەوری لێ چەواشە بوو بێت. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٢٩)* ف [به کسی گویند که به هر جایی برود او را بیرون کنند و گرداگرد او را احاطه کنند.]

**بوو بە کورتانەکەی جەجاڵ:** کورتانی جەجاڵ: گوایا جەجاڵ کە لە ئاخر زەماندا دێت بۆ کەرەکەی هەر کورتان دروست دەکات و

مێروولەیش هەڵی دەوەشێنێتەوە. بە کارێك دەوترێت کە هەر تەواو نەبێت و نەگاتە ئەنجام. هەرساتە ناساتێك هەڵ بوەشێتەوە، ئەنجامەکەی بە هیچ دەرچێت. (جلال محمود بەرگی١. ٩٢) ف [پالان دجال: گویند دجال در آخر زمان برای خرش پالان می‌دوزد و مورچه هم هر روز آن را از هم باز و متلاشی می‌کند. به کاری گفته می‌شود که به اتمام نرسد، و هر لحظه و دقیقه بهم بخورد و آخرش به هیچ و پوچ بینجامد.]

**بوو بە کوردەکەی لە هەر دوو جەژنان بوو (بێوەری):** بە یەکێك ئەوترێ کە لە هەر دوو سەرەوە ناهومێد مابێ. (خاڵ.پ.٩٨) ف [به کسی گفته می‌شود که از هر جانبی محروم و ناامید شده باشد.]

**بوو بە کێچ و چووەکەوڵی:** سەری زۆر کردە سەرو چووە بن کلێشەیەوە. (جلال محمود بەرگی١. ٩٢) ف [بسیار سر به سرش گذاشت و فریبش داد.]

**بوو بە مارەکەی شێخ هۆمەر:** شێخ هۆمەر ناوێك لە جووت دەبێت مارێکی سڕ دەبینێت خەشیمانە هەڵی دەگرێت، کە گەرم دەبێتەوە دەئاڵێتە ملی تا پێوە نەدا وازی لێ ناهێنێت. بە یەکێکی بەد دەوترێت کە لە یەکێکەوە بئاڵێت وازی لێ ناهێنێت تا تووشی چورتومی نەکات. بۆتەوسیشە بەیەکێکی لا پرە سەنگ دەوترێت کە لێت نەبێتەوە. (جلال محمود بەرگی١. ٩٢) ف [شیخ عمر نامی هنگام شخم زدن ماری را می‌بیند که از سرما توان و تحرکی ندارد، از روی بی‌احتیاطی و بی‌تجربگی او را برمی‌دارد و توی پیراهنش می‌گذارد تا گرم شود اما مار پس از گرم شدن به دور گردن او حلقه می‌زند و او را می‌گزد. به کسی گفته می‌شود که وقتی گریبانگیر دیگری شود از او دست برندارد تا آسیبی به او نرساند. برای طعنه به شخصی گفته می‌شود که به پاس خدمت به او، دشمنی پیشه کند].

**بوو بە مەلێك و باڵی گرتەوە:** شوێنی نەما و ون بوو. ف مفقودالاثر شد.

**بوو بە مەلێك و باڵی گرتەوە:** وەك مەلێك باڵی گرت و ون بوو، کەس نازانێت چی لێ هات. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [مانند پرنده پرواز کرد و ناپیدا شد و کسی ندانست چه بر سر او آمد.]

**بوو بە مشکی سەرخەزێنە:** بە یەکێك دەوترێ کە بە سەر ناز و نیعمەتێکدا کەوتبێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٢٩) ف [به کسی گفته می‌شود که بر ثروتی دست یافته باشد.]

**بوو بە مقەبا:** ١) حەپەسا و نقەی لێ بڕا ٢) وەڵامی پێ نەدرایەوە ٣) چاوی هەڵوێستەکەی پێ نەکرا. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٢٩)* **ف** [ ١) متعجب شد و کوچکترین صدایی از او بیرون نیامد. ٢) نتوانست جوابی بدهد. ٣) نتوانست عکس‌العملی از خود نشان دهد.]

**بوو بە مووی لووت:** بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ لێی وەڕس بی و ئەو لێت نەبێتەوە. *(خاڵ. خاڵ. ٩٨)* **ف**[کنایه از کسی که تو از او بیزار باشی ولی او از تو دست‌بردار نباشد. (مزاحم)]

**بوو بە هات هاتەکەی رۆم:** بە شتێك یان کەسێك ئەوترێ کە هەر بڵێن: وا هات، کەچی هیچیشی دیار نەبێ. *(خاڵ. پ. ٩٨)* **ف** [به چیزی یا کسی گفته می‌شود که مدام بگویند آمد و سرانجام هم چیزی یا کسی در میان نباشد.]

**بوو بە هاروون و قاروون:** وەك هاروون و قاروون هەڵگەڕا، دەوڵەمەند بوو، هاروون و قارون برای حەزرەتی مووسا بوون، بڕوایان پێ نەهێناوە *(جلال محمود بەرگی ٢. ٢٩)* **ف** [مانند هارون و قارون زیر و رو شد. هارون و قارون برادران حضرت موسی بودند و به او ایمان نیاوردند.]

**بووە بە ـ بۆتە ـ بنێشتە خۆشەی زاری (دەمی)** **ئەم و ئەو:** خەڵکی لێی دەڵێن و هەمیشە باسی دەکەن، سایا لە حەسوودیدا، یا بە چاکە، یا بە خراپە هەمیشە ناوی دەبەن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٩٤)* **ف** [مردم از او می‌گویند و همیشه از او بحث می‌کنند چه از روی حسودی یا خوبی یا سرزنش باشد. داستانش دهن به دهن رسیده.]

**بووە بە ـ بۆتە ـ داری پەڵك:** بە شتێك، کەسێك، دەوترێت کە بێبەر و بێفەڕ بێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٩٣)* **ف** [به چیزی یا کسی گفته می‌شود که بی‌ثمر و بی‌بهره باشد.]

**بووە بە ـ بۆتە ـ داری سەرەڕێ:** بە یەکێك دەڵێن کە خەڵکی هەمیشە لا بدەنە لای و پەنای بۆ بەرن. ولای بحەسێنەوە و لێ بەهرەمەند بن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٩٤)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که مردم همیشه پیش او بیایند و به او پناه ببرند و پیش او خستگی به در کنند و ازاو بهره‌مند شوند.]

**بووە بە ـ بۆتە ـ ڕەگی گولی لێی نابێتەوە:** بە شتێك دەڵێن کە تووشی یەکێك بێت و لێی نەبێتەوە ولێی دوور نەکەوێتەوە. وەك دەردێکی هەمیشەیی لێ بێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٩٤)* **ف** [به چیزی گفته می‌شود که گریبانگیر کسی شود و از او جدا نشود و

مانند بیماری همیشه با او باشد.]

**بووه بە ـ بۆتە ـ قەرەبرووت:** واسووتاوە ڕەش هەڵگەڕاوە. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٤)* ڤ [سیاە سوختە شدە است.]

**بووه بە ـ بۆتە ـ کەوڵ سووری بەرلەشکر:** بە یەکێك دەڵێن کە لە هەموو کارێك، هەلۆێستێکدا سنگ بداتە پێشەوە و پێشەنگ بێت، جا پێی بڵێن یا پێ نەڵێن. یان بە سووکایەتی بەو خائینانە دەڵێن کە پێش لەشکری دوژمن دەکەون بۆ وڵاتی خۆیان! *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٤)* ڤ [بە کسی گفتە می‌شود کە در هر کاری و در هر موضعی سینە سپر کند و پیش‌قدم باشد. یا بار معنی منفی بە کسانی گفتە می‌شود کە برای تسخیر سرزمین خود یا سرکوب انقلابیون، جلو لشکر دشمن حرکت کند کە مکان‌ها را خوب بلد است.]

**بووه بە ـ بۆتە ـ مەلەوانکەی کوندەلەدەست بەربوو:** بە یەکێك دەوترێت کە لە کارێکدا گیری خواردبێت بە جۆرێك کە نەتوانێت جووڵە بکات. بەر دەچێت ئاو دەیبات، دوا دەچێت گورگ دەیخوات. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٤)* ڤ [بە کسی گفتە می‌شود درگیر کاری یا رویدادی شود بەطوری کە نتواند کاری انجام دهد.]

**بووه بە ـ بۆتە پیاو:** ١) پێگەیشتووە ٢) لە جیهان و ژیان گەیشتووە ٣) هۆشی هاتۆتەوە بەرخۆی و لە خراپە گەڕاوەتەوە ٤) بۆ منداڵ واتە: گەورەبووە. *(جلال محمود بەرگی١ . ٩٥)* ڤ [١) بزرگ شدە است ٢) مسایل مفهوم دنیا و زندگی را درک کردە است ٣) بر سر عقل آمدە و از اعمال بد دست برداشتە ۴) برای بچەها یعنی بزرگ شدە است.]

**بووه بە بەکر مەرگەوەر:** بە یەکێکی زۆربڵێ ئەوترێ کە هەرگیز چاك نەبێ. بەکرەشۆفار (جاسووس) کە دوژمنایەتی ئەشقی مەم و زینی کرد و نەیهێشت پێك بگەن. پاش مەرگی مەم و زین، هاوڕێکەی مەم بەکری کوشت و لەبەر پای مەم و زیندا لە خاك کرا. ساڵی دوایی لەسەر گۆڕی مەم و زین دوو گوڵی سوور سەوز بوون، کەچی دڕکێك لە بەین دوو گوڵەکەدا سەری هەڵدا (نیشانەی بەکر) ئێستاش دەڵێن دڕکی مەم و زین واتە بەکر ـ بەکر مەرگەوەری کە خەڵکی مەرگەوەر بوو. *(خاڵ.پ.١٠٠)* ڤ [بە کسی وراج و پرحرف گفتە می‌شود کە زبانش بە نیکی نچرخد و خوب نشود و نیتش خیر نباشد.]

**بووه بە تانجی:** زۆر لەڕ و لاواز بووە، داوێتیە باریکی و بنێسی *(جلال محمود بەرگی٢ . ٣٠٠)*

ف [بسيار لاغر و ضعيف شده و به بيماری لاغری مبتلا شده است.]

**بووه به پەڕۆی بێنوێژی:** نرخی نەما و ترۆ و سووك و ریسوای ناو خەڵك بوو. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٢٩)* ف [پيش مردم بی‌ارزش و رسوا شده است.]

**بووه بە درۆزنەکەی ئاگر لە ماڵچوو:** بە یەکێك ئەوترێ ئەوەندە درۆی کردبێ کەس پێی باوەڕ نەکا. *(خاڵ.پ.١٠١)* ف [به کسی گويند که اينقدر دروغ گفته باشد که ديگر مردم به او اعتماد نداشته باشند.]

**بووه به دێوی قنگ دۆڕاو:** به یەکێك دەوترێت که لەبەر سەر قاڵیی و سەر جەنجاڵی ئارامی بڕابێت و سەری لێ شێوابێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٢٩)* ف [به کسی گفته می‌شود که به خاطر سرگرم بودن در کار و مشغله‌ی فکری آرام و قرار نداشته و پريشان و سرگردان شده باشد.]

**بووه به رەنگی گولیی لێم نابێتەوه:** بە شتێك ئەوترێ که هەمیشه لەگەڵتا بێ و لێت دوور نەکەوێتەوه. *(خاڵ.پ.١٠١)* ف [به چيزی گفته می‌شود که هميشه همراهت باشد و از تو جدا نشود و دست‌بردار نباشد.]

**بووه به سەگی ناو سەگەل کەوتوو:** به کەسێك دەوترێت که چەند کەسێك دابێتیانه ناو خۆیان و دەستیان کردبێت بە تێهەڵدانی. ئەمە لە رووی سووکیەوه وای پێ ئەڵێن. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٢٩)* ف [به کسی گفته می‌شود که چند نفر او را احاطه کرده و او را تيپا می‌زنند. از روی بی‌آبرويی و رسوايی به او می‌گويند.]

**بووه به سووری دوو دووگر:** به یەکێك ئەوترێ که زۆر تەماحکار بێ و له بەشی خۆی زیاتر هەڵگرتبێ. *(خاڵ.پ.١٠١)* ف [به کسی طمعکار گفته می‌شود که بيشتر از سهم خويش بردارد.]

**بووه به گرێی دڵ:** بۆتە داخ و هۆی مەراق. بە شتێك، یان کارێك دەوترێ که ببێتە هۆی گێرەوکێشە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* ف [مايه‌ی نگرانی و غم و غصه شده است. به چيزی، يا کاری گفته می‌شود که موجب گرفتاری و دردسر شده باشد.]

**بووه به قالۆره (قالۆرەی سووتاو) قالۆرەی ڕەش:** لاواز بووه، وشك بۆتەوه، لە لەڕیدا ڕەش هەڵگەڕاوه. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* ف [لاغر، خشك و ضعيف شده به واسطه‌ی لاغری خشمگين هم شده است.]

**بووه بە کۆی زوخاڵ:** لە خەفەتدا سووتاوه، وەك خەڵوز، ڕەش هەڵگەڕاوه. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* ف [از غم و غصه سوخته و

مانند ذغال سیاه شده است.]

**بووە بە کەری ناو جۆگە، لە هەردوو لا ئەخوا:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە دوو شوێن بەهرەمەند ببێ. جاسووسی دوولایەنە. *(خاڵ.پ.١٠١)* **ف** [به شخصی گفته می‌شود که از دو طرف بهره‌مند شود.]

**بووە بە کتکە نەوتینە (کتکە نەفتینە):** بە یەکێکی فیتنە و ئاژاوەچی ناو خەڵك و بنەماڵە دەڵێن. *(خاڵ.پ.١٠١)* **ف** [به شخصی فتنه‌انگیز و آشوبگر گفته می‌شود که میانه‌ی مردم و خانواده‌ها را بر هم می‌زند.]

**بووە بە کەوی برابرا:** هەردەمە بە دەست یەکێکەوەیە، هەڵی دەسوورێنێت دەیچەوسێنێتەوە و کەڵکی لێ دەبینێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* **ف** [هر لحظه تحت اوامر کسی است و او را می‌چرخاند و آزار و رنجش می‌دهد، از او بهره‌کشی می‌کند.]

**بووە بە کلکی (دوچکەی) ئەو:** هەمیشە لە دوایەوەیە. یان شوێن کەسێ کەوتن. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* **ف** [همیشه به دنبالش است.]

**بووە بە ماستی مەییو (مایگ):** ١) هێمن و کڕ بۆتەوە. ٢) ملی داوە و نقەی لێ بڕاوە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣٠)* **ف** [١) آرام و خاموش شده است. ٢) تسلیم شده و کمترین صدایی از او برنمی‌آید.]

**بووە بە مەقەست هەر کەسێ دەستی بۆ بەرێ دەم دائەچەقێنێ:** بە یەکێکی بێشەرم ئەوترێ کە تا قسەیەکی لەگەڵا بکرێ تووڕە ببێ و قسە بڵێ. *(خاڵ.پ.١٠٢)* **ف** [به شخصی بی‌شرم گفته می‌شود که هرگاه با او صحبت بکنید، عصبانی شده و فحش و ناسزا گوید.]

**بووە بە هەورامی لە کۆڵی خۆی ئەخوا:** واتە لە دیاری خۆت مەخۆ. *(خاڵ.پ.١٠٢)* **ف** [از هدیه‌ی خویش مخور.]

**بووە وە بارووت (بارووت):** زۆر تووڕە بووە و بەسەرخەڵکدا دەتەقێتەوە، شەڕەنگێزیی دەنوێنێ *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [بسیار عصبانی است و بر سر مردم منفجر می‌شود و فتنه‌انگیزی می‌کند.]

**بووگە بە ئاگر ژێر خۆی ناسووتێنێ:** ئەگەرچی دڕندە بێ، بۆ دەور و بەری خۆی مەترسییەکی نییە. *(رخزادی.٧٩)* **ف** [اگرچه آزاردهنده است اما برای اطرافیان خویش خطری ندارد.]

**بووگە بە چنگی پێشە و داکەفتگە:** [پیری بێهێز و لەپاکەوتوو]. **ف** پیری ضعیف و فرتوت. *(حیرت.٨١)*

**بووگە بە گسك:** بە یەکێك دەڵێن کە لەبەر چاوی ئەم و ئەو سووك بووبێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [به کسی گفته میشود که در پیش چشم دیگران بیآبرو و رسوا شده باشد.]

**بووگە بە گوێزی ناو بێژنگ:** بە یەکێك ئەوترێ کە هەر دەمە لە شوێنێك بێ. *(خاڵ.پ.١٠٢)* **ف** [به کسی گفته میشود که هر لحظه در جایی باشد.]

**بووگە بە کتك ( پشیلە ) سەرچنار:** واتە چۆتە سەر شوێنێکی وا کە بۆ ئەو نەشێت، خەڵك پێی پێ دەکەنێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [به جای رفته که شایسته و مناسب او نیست و مردم به او میخندند]

**بووگە بە ملۆزم گیانم: ( تێم ئالاوە و لێم نابێتەوە ):** قینە بەقینەم دەکات و داوای شتی زۆرم لێ دەکات *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [به پر و پای من پیچیده و جدا نمیشود.]

**بووگەسە گاکەی ماڵ مامەحاجیەوە:** بۆ هەموو کەس کار ئەکا، بۆ خاوەن ماڵ نەبێ. **ف**[برای همه زحمت میکشد غیر از صاحب خویش.]

**بووگەسە کەر بێگاری:** [هەر کەس هەڵئەستێ دەستوورێکی پێ ئەدا. **ف** همه به او فرمان و دستور میدهند.]

**بوویە وەگای یەك ئاخور:** بەو کەسە دەگوترێ کە تەنیایە و لەگەڵ کەسدارەفتار نەکا. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [به کسی گفته میشود که تنهاست و با کسی آداب و معاشرت نمیکند. گوشهگیر و منزوی است.]

**بوویەوە کەرباركێش:** بەو کەسەدەگوترێ کە رەنجی بۆ خۆی نەبێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٣١)* **ف** [به کسی گفته میشود که برای خویش تلاش و کوش نکند.]

**بیناگوڵی:** [بە شتێکی یا کەسێکی جوان ئەڵێن. **ف** به چیزی یا کسی زیبا گفته میشود.]

**تەرزەیە:** [بە ئاویکی زۆر سارد ئەڵێن یا کانییە کەوەك تەرزەوایە **ف** به آبی بسیار سرد گویند.]

**جادووگەرە:** [بە یەکێکی فێڵباز ئەڵێن. **ف** به انسانی مکار و نیرنگباز گفته میشود].

**دایك مارانە:** بە یەکێکی ئاژاوەگێڕ ئەڵێن کە ئاژاوە دەنێتەوە. *(عەبدولوەهاب.١١١)* **ف** [به کسی آشوبگر که جنگ و بلوا به راه میاندازد گویند].

**دایکی دزانە:** سەردەستەی دزان، ئەوەی رێ و

شوێن بۆ دزان دادەنێ بۆ دزی کردن، دەلالی دز، هاوکاری نهێنی دز. (عەبدولوەهاب.١١١)
ف[رییس دزدان کسی که راه و روش دزدی را به آنها آموزش می‌دهد و مخفیانه با آنها همکاری می کند].

**دەڵێی پیازی سەرچاویەتی:** واتە ڕقی زۆر لێیە. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٤) ف [از او دلی پر کینه دارد.]

**دەڵێی (ئەیژی) بە تۆڕ گیراون:** [هەموویان سەریان سوورماوە و دەڵێن بۆ ئەوە هەڵبژێراون]. ف آنها در شگفت هستند و گویی برای آن انتخاب شده‌اند. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٥)

**دەڵێی (ئەیژی) خۆڵیان بەسەردا بێژتووە:** [واتە: خەمبار و پەشێوە]. ف افسرده و کسل است. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٧)

**دەڵێی ئاسمان کون بووە و ئەوی لێ کەوتۆتە خوارەوە:** بە منداڵێك دەڵێن کە لای دایك و باوکی زۆر خۆشەویست بێت و هەرچی بکات دەست نەهێننە ڕێگەی بەرییەوە و هەرچی بڵێت سنووری نەبێت. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٣) ف [به بچه‌ای گفته می‌شود که پیش پدر و مادرش بسیار دوست‌داشتنی باشد و هرچه انجام دهد جلو او را نگیرند و گفته و خواسته‌ی او حد و مرز نشناسد.]

**دەڵێی ئاشەوانە (کەری ئاشەوانە):** بە یەکێك دەڵێن شانی ئارداوی بێت پیس بێت. کەسێ کە تۆزاوی و خۆڵاوی، بەردەوام لە کاردا بێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢١٥) ف [به کسی گفته می‌شود که آلوده‌ی مسایلی شده باشد.]

**دەڵێی ئاشی بێ ئاوە (ئاشی ئاوکەوتووە):** واتە کپ و بێدەنگە. دەڵێن ماڵەکە دەڵێی ئاشی ئاوکەوتەیە. (جلال محمود بەرگی١ . ٢١٥) ف [به جایی آرام و بی‌صدا گویند.]

**دەڵێی ئاگری پێوە دەنێن:** [ ١) بە شتێك ئەڵێن کە زوو تەواو بێت زۆرتر بۆ پارە ئەڵێن. ٢) بە کەسێك دەڵێن لەسەر شتێك زوو قەڵس و تووڕە بێ و هەڵچێ.] ف ١) به سرعت تمام می‌شود، به سرعت از دست انسان خارج می‌شود. ٢) کسی که زود عصبی شود و از کوره دررود. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٣)

**دەڵێی ئاڵەتی تێکراوە:** ١) بە یەکێك دەڵێن کە بزێو بێت و لە هیچ شوێنێك سرەوتی نەبێت. کەسێکی توندەمەزاج و تووڕە. (جلال محمود بەرگی١ . ٢١٦) ف [به شخصی ناآرام گفته می‌شود که در هیچ جایی آرامش و قرار نداشته باشد. کسی که حالتی تند و پرخاشگرانه داشته باشد.]

**دەڵێی ئاو هێناویەتی (ئاو لای داوە):** ١) بە یەکێك ئەڵێن کە لەگەڵ خەڵکدا، قسەدا سارد و سڕ و دەمخاو بێت. لەبەر نەزانیی یا خەمباریی خۆی کەڕ کردبێت. ٢) بە شتێك دەڵێن کە بە سووك و خۆڕایی دەست کەوتبێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٣)* ف [١) بە کسی گفته می‌شود که در برخورد با مردم، بی‌رغبت و سرد گفتار باشد. به علت نادانی یا غم و غصه سکوت کرده باشد. ٢) چیزی که به راحتی و بدون زحمت به دست آمده باشد.]

**دەڵێی ئاوری (ئاگری) قودرەتێیە:** ١) بە یەکێکی زۆر هاروهاج دەوترێت کە ئازار بەدەرو پشتی بەگەنێت، ئەوانیش لێ وەڕس بن و هیچی کەیان لە دەست نەیەت و دەرەقەتی نەیەن. زۆر بە توانا و لێهاتووە. ٢) ئەڵێن ئاگری رەق و قینی خواییە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٦)* ف [١) به شخصی ناآرام و بازیگوش گفته می‌شود که به اطرافیانش آزار می‌رساند و دیگران هم از او بیزار بوده و قدرت توانایی و مقابله با او را ندارند. ٢) گویی آتش خشم الهی است].

**دەڵێی ئەرەستووە:** واتە زۆرزان و شارەزا و وریایە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٧)* ف [بسیار دانا و خبره و هوشیار است.]

**دەڵێی ئەرژەنگی دێوە:** بە یەکێکی چڵکن و قژ بژ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٦)* ف [به شخصی چرکین که موی سرش سیخ شده باشد می گویند.]

**دەڵێی ئەرزی موقەدەسە ـ دنیای لێ بۆتە ئەرزی موقەدەس:** واتە شوێنی دەست ناکەوێت لێی دانیشێت. بە تەوسەوە ئەمە دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٦)* ف [جایی را گیر نمی‌آورد در آنجا سکنا گزیند از روی طعنه گفته می‌شود.]

**دەڵێی ئەستێرەی سیوەیلە:** بە یەکێك دەوترێت کە گۆشەگیر و دوورە پەرێزبێت و کەم خۆی دەربخات. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٧)* ف [به شخصی گوشه‌گیر و منزوی و مردم گریز گفته می‌شود که از دیگران پرهیز کند و کمتر در انظار عمومی ظاهر شود.]

**دەڵێی ئەسپی بۆ زین کراوە:** بە یەکێك دەوترێت کە بە پەلە بێت لە سەر رۆیشتنی بۆ شوێنێك. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٧)* ف [به کسی گفته می‌شود که برای رسیدن به جایی تعجیل داشته باشد.]

**دەڵێی ئەلخەنناسی برای شەیتانە:** بە یەکێکی ناپاکی زمان و کردەوە بەد دەوترێت کە هەمیشە خەریکی تەڵەکە بازی و بەدی بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢١٧)* ف [بە

شخصی ناپاک گفته می‌شود که زبان و اعمالش بد و همیشه مشغول نیرنگبازی و دسیسه باشد.]

**دەڵێی ئیستری (هیسر) چەمووشە:** ئێستریکی شێتۆکەیە. واتە هەرزەگۆیەو هەرزە کردارە، جووتە وەشێنە. (جلال محمود بەرگی١. ٢١٧) **ف** [مانند استری دیوانه است یعنی که بیهوده گو و سبک رفتار است و لگدپرانی می کند.]

**دەڵێی ئێسقان لە گەرووی گیراوە:** بە کەسێك دەوترێ کە لە قسەکردندا باش دەنگی دەرنەیەت. یان بکۆکێت و قرخە قرخی بێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٣) **ف** [به کسی گفته می‌شود که در حرف زدن صدایش رسا نباشد و نتواند خوب حرف بزند، سرفه و خرخر سینه داشته باشد.]

**دەڵێی ئێمە لە باوەژنەکەین:** بە گاڵتە وە یان بەڕاست بە یەکێك دەیلێت کە جیاوازیی لەگەڵدا بکەن. بە چاوێکیتر تەماشای بکەن و هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکەن. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٣) **ف** [به شوخی یا به راست به کسی گفته می‌شود که نسبت به دیگران با او تفاوت قائل شوند و به نوعی دیگر او را بنگرند و با او کمتر نشست و برخاست کنند.]

**دەڵێی بۆ ئاگرهاتووە:** زۆر پەلەیەتی ودەیەوێت زوو بڕوات یان بگەڕێتەوە لەو شوێنە دانانیشێت یان هێندە دانانیشێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٠) **ف** [بسیار عجله دارد و می‌خواهد زود برگردد، در اینجا نمی‌نشیند و آنقدر نمی‌ماند.]

**دەڵێی بۆ مزگەوتی دەکا:** واتە بۆ خوای دەکا کە بە یەکێك دەوترێ کە زۆر دڵسۆزانە بۆ کارێ تێ هەڵبچێت و جێبەجێی بکا. بەزۆر لە هەڵوێستێکدا دەوترێ کە ئەو کەسە ئەو لایەنە شیاوی ئەو دڵسۆزییە نەبێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٤) **ف** [برای خدا انجام می‌دهد. به کسی گفته می‌شود که بسیار برای انجام کاری دلسوزی و جدیت از خود نشان می‌دهد. به اجبار به فکر و موضعی گفته می‌شود که آن شخص آن طرف سزاوار آن دلسوزی نباشد.]

**دەڵێی بۆقی پیشاوە:** ١) دەم و چاوی زەرد و ئاوساوە ٢) بەدکار و نامەردە (جلال محمود بەرگی٢. ٧٤) **ف** [چهره‌اش زرد و آماس آورده است. ٢) بدکار و ناجوانمرد است.]

**دەڵێی بازی سەردەستانە:** لە کۆمەڵدا زۆر دیارە. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٣) **ف** [جایگاهش در جامعه بسیار برجسته است.]

**دەڵێی بایە و بە لای گوێیدا دەڕوات:** قسەکە ناچێتە دڵیەوە. سایا لە بەربێ مێشکی، یا لە بەر لاساری. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢١٨)* **ف** [هیچ حرفی را قبول نمی‌کند یا به علت بی‌مغزیست یا به علت حرف نشنوی.]

**دەڵێی بە (...) گوێردا دەڕوانێت:** بە یەکێ دەوترێ کە زۆر مژمۆڵ و داماو بێت. نەزانێ سەروبن و خواروژووری کاری لە کوێیە، دۆژ دامابێت، بە دیاریەوە پەلە لە ئیشەکەدا بکات و دەستە و سانیی بۆی بچێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٤)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که بسیار پریشان و درمانده باشد و نداند سر و ته کارش کجاست، از کارش دور افتاده و تعجیل در انجام آن داشته باشد و لاعلاج قدم بردارد.]

**دەڵێی بە تف پێکەوە نووساوە:** بە شتێك دەوترێ کە پارچەکانی باش قایم نەکرابێت. زوو لێك بترازێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٣)* **ف** [به چیزی گفته می‌شود که تکه‌هایش خوب بهم دوخته یا وصل نشده باشد و زود از هم پاره و گسیخته شود.]

**دەڵێی بە حەوت قەوەتانی بووە:** بە منداڵێ دەڵێن کەزۆر بیلاوێنن؟ زۆر خۆشیان بوێت دەڵێن هێندە منداڵەکەی خۆش دەوێ دەڵێن خۆی بوویەتی. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٣)* **ف** [بچه‌ای که بسیار دوستش بدارند، انگار خودش او را به دنیا آورده است.]

**دەڵێی بە دوای مانگادا دەگەڕێت:** زۆر بە وردی و بە هەتەرەوە بە دوای شتێکدا بگەڕێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٣)* **ف** [بسیار به دقت با شجاعت و قوت قلب به دنبال چیزی گشتن.]

**دەڵێی بە دوو نق و نیو دیویەتی:** بە ژنێك دەوترێت کە منداڵێك لە خۆی نەبێت کە چی زۆر خۆشی بوێت و بیلاوێنێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢١٨)* **ف** [به زنی گفته می‌شود به بچه دیگری که از خودش نیست علاقه بسیاری پیدا کرده و او را نوازش کند.]

**دەڵێی بە رازە (خوگ):** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر دڵ رەق و بێ بەزەیی بێت. یان کەسێکیش لاسار بێ و بە قسەی کەسی‌تر نەکات. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢١٨)* **ف** [به شخصی سنگدل و بی‌رحم گفته می‌شود. کسی که دیکتاتورمنش باشد و به سخن دیگران توجهی نکند.]

**دەڵێی بە زەردەی وەلی کەوتووە:** بە یەکێکی زەردەڵە و لاواز دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٤)* **ف** [به کسی لاغر و ضعیف گفته می‌شود.]

**دەڵێی بە سەربانی جەهەنەمەوە لەوەڕاوە:** بە

یەکێکی ڕەق و تەقی لاواز دەوترێت. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٩*) **ف** [به شخصی لاغر و مردنی گفته می‌شود.]

**دەڵێی بە گوێیانت (گوێچکە) هەڵکێشاوە:** بە منداڵێك دەوترێ، کە لەبەرچاوی ئەو کەسە زوو باڵای کردبێت و گەورە بووبێت. (*جلال محمود بەرگی٢ . ٧٤*) **ف** [به بچه‌ای گفته می‌شود که از دیدگاه کسی زود قد کشیده و بزرگ شده باشد.]

**دەڵێی بە قەڵەموونە:** ١) لە خۆگێف کردنەوەدا ٢) لە نازیرەکیدا. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢٣٤*) **ف** [١) در خود آماده و مهیا کردن ٢) در تنبلی.]

**دەڵێی بتەو دانیشتووە:** بە یەکێك دەڵێن کە نقەی لە خۆی بڕیبێت و وەڵامی پرسیار نەداتەوە. یان یەکێکی بێدەسەڵات و لەکارکەوتووە. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٩*) **ف** [به شخصی می‌گویند که آرام و ساکت نشسته باشد و جواب هیچ سؤالی را ندهد. یا به شخصی ناتوان و از کار افتاده گویند.]

**دەڵێی بەرازی غەزریوە:** بە رازێکە رقی هەستابێت و هەرچی بێتە پێشی پەلاماری بدات. بە ئادەمیزادی رق ئەستوور دەڵێن کە هەر پیش بخواتەوە. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٨*) **ف** [به خوگی خشمگین شده گویند که هر چه بر سر راه او قرار گیرد به آن حمله کند. به انسانی عصبانی گویند که از شدت خشم نفس خود را در سینه حبس کند.]

**دەڵێی بەڕەیە:** زۆر قایمە، وەك بەڕ. (*جلال محمود بەرگی٢ . ٧٤*) **ف** [بسیار محکم است و مانند جاجیم است.]

**دەڵێی بەرد (کوچك) بە گورچووی (وڵك) پیاوا ئەدەن:** [واتە قسەیان تاڵ و ناخۆشە]. **ف** حرفشان تلخ و ناگوار است. (*فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٥*)

**دەڵێی بەردی بن گۆمە:** هیچ نادرکێنێت و هیچ ناڵێت (بێدەنگ دانیشتووە). (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٩*) **ف** [هیچی را بر زبان نمی‌آورد و بی‌صدا و آرام نشسته است.]

**دەڵێی بەڕووی لەدەمدا تەقیوە:** دەم گورجە. بێ وەستان دەدوێ و قسە دەکا. دەم هەراشە. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٩*) **ف** [بدون توقف حرف می‌زند و زبان درازی می‌کند.]

**دەڵێی بەفر هەر لەوێ چۆتەوە:** بە یەکێك دەڵێن کە بچێتە جێگایەکی واوە جێ بەخەڵك لێژ بکات، یان جێگەیەك کە زۆرتر بچنە ئەوێ بۆ کایە، راو و... نەچنە شوێنیتر... یان کاریان لێ تێك بدات و تەنگیان پێ هەڵچنێت. (*جلال محمود بەرگی١ . ٢١٩*) **ف** [به کسی گویند وقتی به جایی برود فشار بر

مردم آورده و کارشان را بر هم بزند و آن-ها را در مضیقه و تنگنا قرار دهد. یا جایی که بیشتر بـه آن روی آورنـد و از جاهـای دیگر کمتر استفاده کنند.]

**دەڵێی بەکرە مەرگەوەرە:** بە یەکێکی فیتنەباز و سەر بە گۆبەنـد و ئاشـووبگێڕ دەوترێـت لـە داستانی مـەم و زینـدا، سـەر چـاوەی هـەموو گۆبەند و کارەساتێکە، مرۆڤێکی بەد و درۆزن و دووڕوو و فیتنـه بـاز بـووە. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢١٩)* **ف** [بـه کسـی نیرنگبـاز و تحریک‌کننده و آشوبگر گفته می‌شود که در داستان مـه‌م و زیـن سرچشـمه‌ی همـه‌ی آشوب‌ها و رویدادهاست که انسانی بدکار و دروغگو و منافق و نیرنگباز بوده اسـت. مه‌م و زیـن نمـاد پـاکی عشـق یـا اهـورایی (نیکی). به‌کر نماد بدی و اهریمنی است.]

**دەڵێی بەنگی کێشاوە:** بە یەکێکی گێژ و حـۆل دەوترێ، کە ئاگای لە خۆی نەبێت، یان بەمـلاو بـەولادا بکـەوێت. *(جەلال محمود بەرگی٢. ٧٤)* **ف** [به کسی گیج و منگ گفته می‌شود که از خود آگاهی نداشته باشد و به این طـرف و آن طرف بیافتد.]

**دەڵێـی بـڕە نۆکـە:** واتـە: بـالای زۆر کورتـە. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢١٩)* **ف** [بسیار قـدش کوتاه است.]

**دەڵێی بریشکان دەخوا:** زۆر بە پەلە قسە دەکا یان بە رووی لە دەمـدا تـەقیوە. *(جەلال محمود بەرگی٢. ٧٤)* **ف** [بسـیار باعجلـه صـحبت می‌کند یـا در دهـانش بلـوط منفجـر شـده است.]

**دەڵێی بز بزۆکە:** بزبزۆك= زینـدە وەرێکـە لـە قاڵۆنچە بچووکترە و زۆر دەجووڵێـت واتـە لـە کاردا، وریـا و گـورج و گـۆڵ و ئازایـە. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢٢٠)* **ف** [شخصـی را گوینـد که در انجام دادن کار، هوشـیار، چابـک و شجاع است.]

**دەڵێی بلبلە قسەدەکات:** واتە قسەزانە. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢٢٠)* **ف** [سخندان است.]

**دەڵێی بنەمۆمـە:** بە یەکێك دەڵـێن زۆر کورتـە بنە بێت. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢٢٠)* **ف** [بـه کسی گفته می‌شـود کـه بسـیار کوتـاه قـد باشد.]

**دەڵێی بووکە بارانەیە:** بە یەکێك ئەوترێت کە هـەموو لەشـی تـەڕ بووبێـت. *(جەلال محمود بەرگی١. ٢٢٠)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که تمام اعضای بدنش خیس شده باشد.]

**دەڵێی تا نجیبیەکەی ئەحمەدی عەزیز ئاغایە، لە کاتی راودا گووی دێت:** بە یەکێك دەوترێـت کە لە کاتی کار و پێویستیدا خۆی بخلافێنێت

و بیانوو بدۆزێتەوە. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٢) **ف** [به شخصی گفته می‌شود كه در موقع ضروری خود را فريب دهد و بهانه بياورد.]

**دەڵێی تەرسەقولێكن و كراون بە دووكەرتەوە ـ دەڵێی جاشی ماكەرێكن:** بە دووكەسی خراپی هیچ و پووچ دەوترێت كە لە یەك بچن یا بە دووشت دەوترێت كە ناتەواو بن و لە یەك بچن. بە تەشەر وایان پێدەڵێن. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٢) **ف** [به دو نفر بی‌ارزش و بيكاره گويند كه مانند هم باشند يا از روی كينه و طنز به آن‌ها گفته می‌شود.]

**دەڵێی تەندووره سەرت ناوەتەوە:** [هەوا زۆر گەرمە]. **ف** هوا به شدت گرم است. (فتاحی قاضي بەرگی٢ . ١٢٧)

**دەڵێی تفاندوویانەتە دەم یەك ـ تفیان كردووتە دەم یەك:** بە دوو یا چەند كەسێك دەڵێن كە لە سەرشتێك، كارێك، قسەیان یەك بێت، وەك لەوە پێش تەكبیریان كرد بێت و یەكیان گر تبێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٣) **ف** [به دو يا چند نفر گفته می‌شود كه در مورد مسايلی، چيزی يا كاری اتفاق نظر دارند و از قبل با هم تبادل‌نظر كرده و همديگر را خوانده‌اند و به توافق رسيده‌اند.]

**دەڵێی تل و خوێیە:** بە خواردنێك دەوترێ كە زۆر سوێر بێت. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥) **ف** [به غذايی بسيار با نمک و شور گفته می‌شود.]

**دەڵێی تووتییە:** بۆ تەوس و گاڵتە پێ كردنەوە. ١) بە یەكێك دەوترێت كە قسەی یەكێكی‌تر بكاتەوە و پشتگیری بكات. واتە: بێ مێشكە بێ كەسایەتی (شخصیت) بوودەڵەیە و خۆی بیر ناكاتەوە ٢) بە منداڵێكی بچووك دەڵێن كە قسەی دەور و پشتەكەی بڵێتەوە و لاساییان بكاتەوە. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٣) **ف** [١) برای طعنه و شوخی است به كسی گفته می‌شود كه سخن كسی ديگر را بازگو كند و از آن طرفداری كند. بی‌مغز و بی‌شخصيت و بی‌نموداست، انديشه و تفكر ندارد. ٢) به بچه‌ای كوچک گويند كه سخن اطرافيان را بازگو كند و ادای آن‌ها را درآورد.]

**دەڵێی توولەی (گوێ) گوێچكە بڕاوە:** واتە ئازا و جەربەزەیە. لە رووی سووكیەوە بەكار دەهێنرێ. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥) **ف** [شجاع و با جرأت است از روی تحقير گفته می‌شود.]

**دەڵێی توێی ئاوە:** زۆر سپی و جوان و ناسكە. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥) **ف** [بسيار سفيد و زيبا و نازک است.]

**دەڵێی تێلاّیان تێ بڕیوە:** بە یەکێك دەوترێ کە قوشقی بوبێت و بشیرێنێت قسە بەدەنگی بەرز بکات. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [به شخصی عصبانی گفته می‌شود که داد و فریاد سر دهد و با صدای بلند حرف بزند.]

**دەڵێی پۆڕی خوراوە ـ کردو یانە بە پۆڕی خوراو:** ١) نابووتیان کردووە ٢) هەژار کەوتووە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢١)* **ف** [١) ورشکستش کرده‌اند ٢) به فقر و نداری افتاده است.]

**دەڵێی پێ بە هێلکە دا دەنێت:** لەسەر خۆ ئەڕوات و هێواش پێی دبزوێنێت و هەنگاو هەڵ دەگرێ. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٢)* **ف** [آرام می‌رود آهسته قدم برمی‌دارد.]

**دەڵێی پا پۆڕەکەی (کەشتیەکەی) نوقوم بووە:** دۆش دامابێت و مەلوول دانیشتبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢١)* **ف** [به کسی گویند که افسرده و غمگین نشسته باشد.]

**دەڵێی پارووی لە دەمدایە:** بە یەکێك دەڵێن کە لە قسەی نەگەن و هەر پلتەپلتی بێت لە قسە کردندا. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢١)* **ف** [کسی یاوه‌گو و فلسفه‌باف را گویند که حرف او را نفهمند.]

**دەڵێی پاڵەوانەکەی هەنرە:** بە یەکێك ئەڵێن کە ئیدیعای گەورەیی بکا و خۆی بە زل بزانێ بەلاّم وایش نەبێ (هەنڕ) دێیەکە لە ناوچەی ژاوەڕۆ سەر بە شاری سنە. **ف** [به کسی متکبر و خودبین گویند که ادعای بزرگی کند ولی در عمل چنین هم نباشد.]

**دەڵێی پەتیووکەیە:** باڵندەیەکی بچووکی زرنگ و زیتە. واتە وەك پەتیووکە وریا و زیتە بەتایبەتی بە منداڵی زرنگ دەوترێت. . *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢١)* **ف** [پرنده‌ای کوچک و زرنگ است. مانند پەتیووکە هوشیار و زرنگ است خصوصاً به بچه‌ای زرنگ و هوشیار گفته می‌شود.]

**دەڵێی پەپوولەی بەهەشتیە:** ١) بە منداڵێکی ئێسك سووکی جوان دەڵێن ٢) بە یەکێکی زۆر بێدەنگی بەستەزمان و بێ‌وەی دەڵێن ٣) بە یەکێکی زۆر پاك و خواپەرست دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٤)* **ف** [١) به بچه‌ای دوست داشتنی و زیبا گفته می‌شود. ٢) به شخصی بسیار آرام و بی‌سر و صدا و بی‌آزار گویند. ٣) به کسی بسیار مسلمان و خداپرست گویند.]

**دەڵێی پەلە پووشە:** [وەك تۆزقاڵی کا و پووشە قورسایی نییە]. **ف** مثل ذره‌ی کاه و پوشال کم‌وزن است. *(فتاحی قاضي بەرگی١ ١٩٦).*

**دەڵێی پەڵەهەورە:** بە یەکێکی قەبەی زلە

دەڵێن کە حەز لە چارەی نەکرێت و بەر چاوی گرتبێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢١) **ف** [شخصی لندهور و تنومند را گویند کە از او بیزار باشید.]

**دەڵێی پەڵخەگامێشە:** بە یەکێك یان منداڵێکی قەڵەوی خرت دەوترێ. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٤) **ف** [به کسی یا بچەای چاق و کوتاه قد گفته می‌شود.]

**دەڵێی پەلکە بزانە:** پەلکە بزان گیاندارێکی ئەفسانەی هار و هاج و خاوەن جموجووڵە. بە منداڵێك دەوترێت کە زیت و هار و هاج بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢١) **ف** [موجودی افسانەای ناآرام و بازیگوش و صاحب جنب و جوش است به بچەای زرنگ و باهوش و ناآرام و بازیگوش گفته می‌شود.]

**دەڵێی پەیژەی جەهەنەمە ـ پەیژەی دزە:** بۆ گاڵتە. یان سووکی بە یەکێکی زۆر درێژ دەڵێن. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٤) **ف** [برای شوخی یا رسوایی به شخصی دراز قد گویند.]

**دەڵێی پەینە:** [تامێکی ناخۆشی هەیە. یان بۆ خواردنی بێ تام دەوترێ.]. **ف** طعم نامطبوع دارد. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٦)

**دەڵێی پشتەماڵی حەمامە:** بە یەکێکی بێ بار دەوترێت کە هەر دەمە رووی لە لایەك و سەربە یەکێك یان دەستەیەك بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢١) **ف** [به شخصی دمدمی مزاج گفته می‌شود که هر لحظه رو به طرفی یا کسی، دستەای و گروهی باشد.]

**دەڵێی پشیلەی کەللەخانەیە:** بە یەکێکی سەررزلی قەڵە و دەڵێن. پشیلەی پاچە خانە گۆشت زۆر دەخوات و زۆر قەڵەو دەبێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٢) **ف** [به شخصی سر گنده و چاق می گویند.]

**دەڵێی پووشکەیە:** زۆر سووکە. سەنگ کەمە (جلال محمود بەرگی٢. ٧٤) **ف** [بسیار سبک و کم‌وزن است.]

**دەڵێی پووڵی نارەواجە:** [کەسێ نایەوێ و لەبەر چاو خەڵك کەوتووە]. **ف** کسی خواهان او نیست، از چشم مردم افتاده است. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٧)

**دەڵێی پێ لە مێرووڵان دەنێ:** [لەسەرخۆ هەنگاو هەڵدەگرێ]. **ف** به آهستگی قدم برمی‌دارد. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٦)

**دەڵێی پیرێژنی دۆ رژاوە:** واتە دۆش داماوەو خەفەتبار دەنوێنێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٢) **ف** [یعنی افسرده و غمگین به نظر می‌رسد.]

**دەڵێی پێکۆرەی جەواڵدرە ـ دەڵێی شێرەکوللەیە:** بە یەکێکی لەڕی باریك

دەوترێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٢) ف [بە شخصی لاغر اندام گفته میشود.]

**دەڵێی پیکی پۆڵایە:** لەش ساخ و قایم و بەهێزە. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٤) ف [تندرست و محکم و نیرومند است. چون پتک پولادین محکم است.]

**دەڵێی جاشی ماکارێکن:** بە دوو کەسی خراپی هیچ و پووچ دەوترێ کە لە یەك بچن. بە دوو شت دەوترێ کە ناتەواو بن و لەیەك بچن. یان بەرقەوە وایان پێ دەوترێ. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥) ف [بە دو نفر بدکار و بیارزش گفته میشود کە شبیه بە هم باشند یا بە دو چیز ناقص و ناهماهنگ کە شبیه بە هم باشند یا از روی کینه بە آنها گفته میشود.]

**دەڵێی جن پیدا تسیوە:** بە شتێك دەڵێن کە زوو تەواو بێت، یان کەمی کردبێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٣) ف [بە چیزی گویند کە زود تمام شود یا کاهش یابد.]

**دەڵێی جن گۆڕیویەتی:** بە منداڵێکی ناشیرین دەوترێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٤) ف [بە بچەای زشت گفته میشود.]

**دەڵێی جنۆکەیە:** منداڵێکی لاوازی ناشیرین دەوترێت. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٤) ف [بە بچەای لاغر و زشت گویند.]

**دەڵێی جووکییە:** بە یەکێك دەوترێ کە زوو تووڕە بێ. (جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥) ف [بە کسی کە بسیار خشمگین باشد می گویند.]

**دەڵێی جوولەکەیە و خمی لێ شێواوە:** [واتە پەریشان و دەستەپاچەیە]. ف آشفته و سراسیمه شده است. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٦)

**دەڵێی جوولەکەیە و خوێنی دیوە:** [زۆر ترساوە]. ف زیاد دچار ترس و خوف شده است. (فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٧)

**دەڵێی جوی ترسەنۆکی:** [زۆر لە رادەبەدەر ئەترسێ]. ف بیش از حد میترسد. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٧)

**دەڵێی جیوەی تێ کراوە:** بە یەکێکی زۆر بزێو دەڵێن. (جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٤) ف [بە بچەای ناآرام و بازیگوش و بیقرار گویند.]

**دەڵێی حۆڵی بیابانە دەسووڕێتەوە:** واتە گێژگێژ دەسووڕێتەوە. حۆڵی بیاوان = ئەمەجنسێکی شەیتانییە، بانگ دەکات دەڵێت وەرە لە بەرچاوی ئەو کەسە زل دەبێت تا سەری دەگاتە ئاسمان، تا لە ناولنگیەوە ئاسمان دیار دەبێت، سزای مرۆڤ دەدات. دەیترسێنێت، شێتی دەکات تاکوشتن بە بەریەوە هەیە، چارەی بە دۆعا خوێندن و

دەست بۆ بەندەخوێن بردن دەبێت. بەمە پیاو رزگاری دەبێت. ئاشکرایشە کە ئەمە هەمووی شتێکی ئەفسانەیە و کۆن. ئەم بڕوایە لە کوردەواریدا باو بووە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٥)* **ف** [بیهوده و خودسرانه می‌چرخد. (حۆلی بیابان = موجودی شیطانی است و فریاد می‌زند و می‌گوید بیایید و پیش چشم آن شخص بزرگ می‌شود و سرش به اوج آسمان می‌رسد. به انسان آزار می‌رساند و او را می‌ترساند و تا پای جان دیوانه‌اش می‌کند علاجش اینست که فرد باید دعا بخواند دست به بند شلوارش ببرد و با این وسیله است که انسان نجات پیدا می‌کند و همه این چیزها تخیل و افسانه است و این عقاید در میان کردها رایج بوده است).]

**دەڵێی حەبی قووت داوە:** بە یەکێك دەڵێن کە خاو و خلیچك و گێژ و وێژ بێت. دیارە دەبی حەبی خەو بێت. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٥)* **ف** [بە کسی شل و ول و گیج و منگ گفته می‌شود، شاید قرص خواب باشد.]

**دەڵێی حە پۆل مێشخۆرە:** زەلامێکی بێکارە و گێرە. گەمژەیە. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٥)* **ف** [مردی بیکار و گیج و هالوست.]

**دەڵێی حەمامە:** [بە جێگایەکی زۆر گەرم دەڵێن]. **ف** به هوای اطاق یا جای بسیار گرم گفته می‌شود. *(فتاحی قاضی بەرگی١ ١٩٧)*.

**دەڵێی حوشترە (وشترە):** لە بەرزی و مل درێژی و بەکێشیدا. واتە بە یەکێك دەڵێن کە سیفەتێك لەوانەی تێدا بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٥)* **ف** [در بلندی و گردن درازی و صبوری به کسی گفته می‌شود که یکی از این صفات را داشته باشد.]

**دەڵێی حوشتری (وشتری) ناو پەمووە:** بە یەکێکی درێژ و قووچ دەوترێت کە لەگەڵ چەند منداڵێکدا بەرێدا بڕوات. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٥)* **ف** [به شخصی بلند قد گفته می‌شود که با چند بچه راه برود.]

**دەڵێی حووجی بنی حەلەقە:** بە یەکێك دەڵێن کە زور درێژ بێت (ئەم ناوەلە عووجی بن علق)ی عەرەبییەوە کە ناوێکی ئەفسانەیە هاتۆتە زمانی کوردییەوە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٥)* **ف** [به شخصی قددراز و بلند قد می‌گویند که اسمی افسانه‌ای است که از زبان عربی وارد زبان کردی شده است.]

**دەڵێی خۆڵی مردووی بە سەردا بێژراوەتەوە (کراوە):** بە یەکێك دەڵێن کە خەفەتبار دانیشتبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٦)* **ف**

[بە کسی می‌گویند کە ساکت و غمگین نشستە باشد.]

**دەڵێی خاسەکەوی جۆزەردانە:** [بە ژنی جوان خاس و تەرپۆش و رازاوە دەڵێن]. ف بە زنی بسیار زیبا و دلارام گفتە می‌شود. خاسەکەوی جۆزەردان/ ناخۆشە دەست لێك بردان: خاصە کبک خردادماە. جدایی و دوری ناخوشایند است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .١٩٧)*

**دەڵێی خەرامانی چینە:** خەرامان ئافرەتی شەنگ و شۆخ. واتە دەڵێی ئافرەتە شەنگ و شۆخەکەی چینە کە لە چیرۆکدا ناودارە. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٦)* ف [خرامان دختری زیبا و رعنا است همان دختر زیبای چینی است کە در داستان‌ها مشهور است.]

**دەڵێی خرسەکە (خەرسەکە):** بە کولێرەی ئەستوور دەوترێ. خەر سەك گەمژەیە. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٥)* ف [بە گردە نانی ضخیم گفتە می‌شود. گردەی کلفت.]

**دەڵێی خلێنە گووە:** بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە خڕ و بچووك و قەڵەو بێت. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٦)* ف [برای رسوایی است بە شخصی کوتولە و چاق گفتە می‌شود.]

**دەڵێی خودا خەنی کردووە:** [دەڵێی خوا ئەوی دەوڵەمەند کردووە لە رادە بەدەر خۆشی و شادی ئەکا]. ف گویی خداوند او را غنی کردە است یعنی زیاد از حد از خود خوشحالی نشان می‌دهد. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .١٩٧)*

**دەڵێی خوریی خواردووە و پەتك دەڕی (دەڕدێت):** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر لە سەر پێشاو بمێنێتەوە. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٦)* ف [بە کسی می‌گویند کە زیاد در توالت بماند.]

**دەڵێی خێوە:** واتە زۆر ناشیرینە و پیاو لێی دەترسێت. خێو= خاوەن. گوایا مردوو کە مرد جاری وا هەیە روحیانەتەکەی دێتە ئەو شوێنەی خۆی و لەویدا دەگەڕێت و بەرچاو دەکەوێت. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٦)* ف [بسیار زشت است و انسان از او می‌ترسد. گویند بعد از مرگ مردە روحش بە جای قبلی برمی‌گردد و در آنجا بە گردش می‌پردازد و بە چشم دیدە می‌شود.]

**دەڵێی دۆمە و خەڵات کراوە:** [دۆم= ناوی هۆزێکی کوردە، دەڵێی دۆمە و خەڵاتی پێ دراوە لە خۆی گۆڕاوە و فیزی پەیا کردووە]. ف دوم= نام عشیرەای از اکراد است. گویی دوم است خلعت و هدایا بە او دادەاند و افادە پیدا کردە است. *(فتاحی قاضی بەرگی٢

١٢٨.)

**دەڵێی داری بنێشتە:** داری بنێشت دارەبەنە. واتە ناشیرینە. چونکە داری بنێشت بۆ بنێشتەکەی ئەوەندە برینداری دەکەن، قەدەکەی چاڵ چاڵ و ناشیرین دەبێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* ڤ [درخت سقز، درخت بنه است یعنی زشت است چون که درخت سقز را برای سقزش اینقدر زخمی می کنند قامتش زشت و بدریخت می‌شود.]

**دەڵێی داری چاکییە:** [لەسەر جێگای خۆی راوێستاوە و نابزوێ]. ڤ ثابت سر جای خودش ایستاده است و تکان نمی‌خورد. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .١٩٨)*

**دەڵێی داری گەندەڵە:** واتە داویەتە دواوە و تابێت کەم دەکات و کز دەبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٦)* ڤ [در کاستی است و هر چه می‌آید کاهش می‌یابد و ضعیف می-شود.]

**دەڵێی داری واوەیلایە:** داری واوەیلا دارێکی بێ‌لق و پۆپی وشکە. بە یەکێك دەڵێن وشك ورەق درێژ هەڵچوو بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٦)* ڤ [درخت واویلا، درختی بی‌شاخ و برگ و خشک است به شخصی که بسیار لاغر و بلندقد گویند که سریع رشد کرده باشد.]

**دەڵێی داریان لە سەری داوە:** [واتە گێج و وڕ بووە]. ڤ گیج و منگ شده است. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٨)*

**دەڵێی دالـی دیـار لا پووره:** (لاپوور= لاکی) ئاژەڵی تۆپیوە، مردارەوە بوو لە رووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێ کە چاوەڕێی مردنی یەکێك بێت. بۆ ئەوەی بە میراتەکەی شاد بێ. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٥)* ڤ [حیوانی مردار شده است، از روی رسوایی به کسی گفته می‌شود که چشم انتظار مردن کسی باشد تا به ارث و میراسش برسد.]

**دەڵێی دانی (دیانی) مارە:** واتە زۆر زیرەکە: زوو دەگاتە ئەنجام. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٧)* ڤ [بسیار زیرک است و کارایش سریع است.]

**دەڵێی دە زاری یەك تفیون (تفیان کردووەتە دەم یەك):** [قسەیان یەکێکە، نرخیان یەکێکە، بە دووکاندار دەڵێن: هەموو یەك نرخ و یەك قسە شت دەفرۆشن. کەسێك لە ئەو یەکەکە شتێکی هەرزانتر نافرۆشێ]. ڤسخن همه یکی است، نرخ همه یکی است، کسی از دیگری جنس را ارزان‌تر نمی‌فروشد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٨)*

**دەڵێی دە(لە) ئەشکەوتێدا قسان دەکا:** بە

دەنگی بەرز قسان دەکا. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [با صدای بلند صحبت می کند.]

**دەڵێی دەرزی قـووت داوە:** واتـە لاوازە *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [لاغـر و ضـعیف است.]

**دەڵێی دەسك و هێشووی بۆ کـردووین:** منـەتمان بەسـەردا دەکـات. دەڵێـی بـەری بـۆ رنیـوین. بەرەدرەوی بۆ پەڕانـدووە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [بر ما منت می گذارد. گویی کار شاقی را انجام داده است.]

**دەڵێی دەکوولەکـەی دا قسـان دەکـا:** [زۆر بـە ئارامی قسە دەکا کەس لە قسەکانی تێناگا]. **ف** چنان آهسته حرف مـی‌زنـد کـه کسـی نمی‌فهمد. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٨)*

**دەڵێـی دەڵـەدێوە:** بـە ژنێکـی کەتـەی قەبـە دەوتـرێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [بـه زنی لندهور و چاق گفته می‌شود.]

**دەڵێی دڕکی مەم و زینە:** واتـە کـە لـە یـەکێك ئـالا لێـی نابێتـەوە، هێنـدە بـەد و نالـەبارە، دڕکی مەم و زین= لە داسـتانی مـەم و زینـدا کاکە مەم و خاتو زین دوو دڵداری گیـانی بـە گیانی بوون، بەڵام بە کرمەرگەوەر بە بوختـان و دوو زمانی کەوتە نێوانیان و نەیهێشت ببنە چارەنووسـی یـەك، تـا کاکـە مـەم گـیراو لـە زیندانندا بەداخەوە مرد. دوای ئـەو لـە داخـدا خاتوو زینیش خۆی کوشت و لە تەنیشت کاکە مەمـەوە نێـژرا. دوای مردنیشـیان بـەکر مەرگـەوەڕ وازی لـی نـەهێنان، تـا رۆژێـك براکەی خاتو زین هەر لەوێدا دەیکوژێت. لـە جێی خوێنەکەی کۆمەڵە دڕکێك شین دەبێت، لە ناوەنـدی هـەر دوو گـۆڕە کـەدا هـەر چەند هـەڵیّ دەکـەنن هـەر شـین دەبێتـەوە. ئەمەیـە دڕکی مەم و زین. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٢٧)* **ف** [وقتی به دور چیزی بپیچد یا گریبانیر کسی شود به راحتـی از او جـدا نمـی‌شـود. بسیار بدخواه و آزاردهنده و ناهموار است. دڕکی مەم و زین = خار میان مهم و زین، در داستان مهم و زین برادر مـهم و خـانم زیـن دو عاشق و معشوق بودند، امـا بـه‌کـر مـه-رگه‌وه‌ر، با بهتان و سخن‌چینی میانه آن‌هـا را بهم زد و نگذاشت بهم برسـند و نصیب هم شوند. تا روزی برادر مـهم بازداشـت و متأسفانه در زندان می‌میرد و بعد از او زین هم خودکشی می کند و در کنار قبر مهم به خاک سپرده می‌شود و بعد از مـرگ آن‌هـا باز به‌کر مـه‌رگـه‌وه‌ر دسـت از سـر آن‌هـا برنمی‌دارد همیشه بر سر قبر آن‌ها می‌آید و در میان گور آن‌ها می‌نشیند. تا روزی برادر خانم زین در همانجا او را به قتل می‌رساند

و در جایی که خون به کر بر زمین ریخته می‌شود بوته خاری سبز می‌شود یعنی وسط دو قبر هر چقدر خار را ریشه کن می کنند باز هم سبز می‌شود. (خار میان مەم و زین اینست).]

**دەڵێی دووگیانە:** بە یەکێکی سستی تەمەڵ دەوترێ کە هەڵس و کەوتی خاو و خلیچك بێت وەك ئافرەتێکی سکپڕ *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* ف [به کسی سست و تنبل گفته می‌شود که در نشست و برخاست شل و ول باشد مانند زن آبستن.]

**دەڵێی دیزەی ڕەشە ـ فیسارکەس دیزەی ڕەشەیە:** موسوڵمانێکی بێ‌وەی دەوترێت کە گویا ناو بردنی بەخراپە ـ یان خراپە دەر بارەکردنی (وتنی) مەردوم تووشی زیان دەکات. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٨)* ف [به مسلمانی بی‌اذیت و آزار گفته می‌شود که بد گفتن پشت سرش موجب آزار و رنج دیگران خواهد شد.]

**دەڵێی دێزەی ڕەشە:** وا باوە کە سەید لە هەر کەسێك بتۆرێت ئەو کەسە گرفتار دەبێ دەڵێن دێزەی ڕەشە واتە دەروونی ڕەشە و نزای لای خوا وەردەگیرێت. *(جلال محمود بەرگی١ .٨٩)* ف[اینطور معمول شده که سید هر گاه از کسی دلگیر شود آن فرد گرفتار خواهد شد.]

**دەڵێی دیواری رووخاوە:** [بە یەکێکی ئەڵێن کە نزیك بوونەوەی پڕ لە مەترسییە و زیاندەرە]. ف نزدیک شدن به او خطرناک است، آدم مضری است. *(فتاحی قاضي بەرگی١ ٢١٣).*

**دەڵێی دیوەخانی ئەلیا سەفرەیە:** ئەلیاسەفرە= یەکێکە لە پیران و پیاو چاکانی کورد گۆڕەکەی لە پێنجونیە. واتە هەمیشە جمەی دێت و پڕە لە مێوان. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٨)* ف [«الیاس فرە» یکی از پیران و نیک مردان کرد است که زیارتگاهش در پینجوین است که مزارش همیشه شلوغ و پر از زایر است .]

**دەڵێی ژنە باخەوانە:** واتە هەمیشە شاتەی دێت، دەشیرێنێت و دەنگی دێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٩)* ف [همیشه با صدای بلند می‌غرد و فریاد می‌زند.]

**دەڵێی ڕۆژی حەشرە (مەحشەرە):** واتە شوێنە کە زۆر جەنجاڵە، ڕێ بەر ڕێدار ناکەوێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٨)* ف [جای بسیار شلوغ است و عبور و مرور به کندی در آن انجام می گیرد.]

**دەڵێی ڕۆنی سەگ، ورچ، لە قەلبی، لە لەشی دەدەن:** بە یەکێك دەڵێن کە بە زیانی مەردوم

دڵخۆش بێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٨)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که به ضرر و زیان دیگران دلخوش باشد.]

**دەڵێی راوی دەنێن:** به یەکێك دەوترێ کە زۆر خێرا بڕوات، وەك دوای کەوتبن و بیانەوێت بیگرن. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که بسیار سریع برود مانند اینکه دنبالش کرده باشند و او را بگیرند و بازداشت کنند.]

**دەڵێی رەپێی دەنێن:** [واتە هاتوچۆ و جموجوولی بە پەلەیە]. **ف** حرکاتش با عجله و شتاب توأم است. *(فتاحی قاضي بەرگی١ ١٩٩.)*

**دەڵێی رمبی (رمی) دەقوونگی شای کوتاوە:** [وا ئەزانێ کارێکی گرنگی جێبەجێ کردووە کە هیچیش وا نییە]. (رم= نیزه) **ف** گمان می‌کند کار بزرگ و خطیری را انجام داده است در حالی که چنان نیست. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٩)*

**دەڵێی رمووزنە:** رمووزن= دێوێکی کینە لە دڵی ناشیرینە بە یەکێکی ناشیرینی سامناك دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٨)* **ف** [رمووزن: دیوی زشت و کینه‌جوست به شخصی زشت و ترسناک گفته می‌شود.]

**دەڵێی رێویی گەزیزان خواردووە:** گەزیزە= گوڵێکی حەوت رەنگی جوانە، هەر دەمێك رێوی بیخوات تووڵەك (گەڕ) دەبێت بۆ گەمە بە یەکێك دەڵێن کە لاواز بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٨)* **ف** [گلی هفت رنگ و زیباست، هر وقت روباه آن را بخورد به بیماری گری مبتلا می‌شود برای شوخی است به شخصی گفته می‌شود که لاغر و ضعیف باشد.]

**دەڵێی رێوییە:** ١) بە یەکێکی سیسی لەڕ دەوترێ ٢) بە یەکێکی فێڵاوی زۆرزان دەوترێ *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [به کسی پژمرده و لاغر گفته می‌شود. ٢) به کسی نیرنگ‌باز و بسیار آگاه گفته می‌شود.]

**دەڵێی زەرووە (زالوو):** واتە خوێنی خەڵك دەمژێت، رەنجی ئەم و ئەو بۆ خۆی دەبات. جاران کە کوردەواریدا زەروویان بەکار دەهێنا بۆ خوێن گرتن لە یەکێك کە جۆرە نەخۆشییەکی ببوایە گوایە ئەو کەسە خوێنی پیسی لە لەشدایە. زەرووەکەیان دەنا بە خوێن هێنەری ئەو کەسەوە بە تایبەتی لە سەر و چاو و قوڕگدا. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٢٩)* **ف** [یعنی خون مردم را می‌مکد، از دسترنج دیگران استفاده می‌کند. در گذشته در میان کردها از زالو برای خون گرفتن (حجامت) از کسانی که بیماری خاصی داشتند استفاده

می‌شد و زالو را بر روی جایکه می‌بایست خون را بمکد می‌گذاشتند.]

**دەڵێی زەعفەرانە (زەعفەرانی زەرد):** واتە زەردە هەڵگەڕاوە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [زرد و ضعیف شده است.]

**دەڵێی زەعفەرانی زەردە:** بە یەکێك دەڵێن کە زەرد هەڵگەڕابێت، لاواز بێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٩)* **ف** [به کسی که زرد و ضعیف و لاغر شده گفته می‌شود.]

**دەڵێی ساڵی گرانییەکەیە:** بە یەکێك کە بە پەلە و هەڵەشە نان بخوات یان هەڵپەوشپرزیی دەسکەوتی نانی ببێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که در غذا خوردن تعجیل داشته باشد یا برای به دست آوردن نان شتاب داشته باشد.]

**دەڵێی سایمەلێی داوە:** سایە دەردێکە هەرکەس بیگرێت گێژو وڕی دەکات بە یەکێك دەوترێت کە وروکاس و حەپەساو بێت یان وا بنوێنێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٩)* **ف** [سایمه= یک نوع بیماری دامی است که هر کس به آن مبتلا شود گیج می‌شود. به کسی گفته می‌شود که گیج و منگ و بهت زده باشد یا اینطور به نظر برسد.]

**دەڵێی سەختیانە:** واتە زۆر چڵکنە وەك پێستێکی خۆ شکراو لە چڵکدا رەق بوو. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٩)* **ف** [بسیار کثیف است مانند پوستی دباغی شده است که از چرک پوشیده و سفت شده باشد.]

**دەڵێی سەرو پێی ئاوەڕووت کراوی:** [بە کەسێك ئەڵێن کە مووی سەر و روومەتی هەڵوەریبێ و ناشیرین بووبێت]. **ف** به کسی گفته می‌شود که موهای سر و صورتش ریخته یا آنها را تراشیده در نتیجه بدمنظر شده باشد. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٨)*

**دەڵێی سەربڕاوە:** بە نووستوویەك دەوترێ کە خەوەکەی زۆر قووڵ و خۆش بێت بە بۆنەی ماندوویەتییەوە. بە کەسێکیش دەڵێن کە لە کاتی خەودا دەمرخێنێ وەك ئاژەڵی تازەسەربڕاو. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [به شخص خوابیده‌ای گفته می‌شود که به علت خستگی خوابش بسیار عمیق و خوش باشد و همچنین کسی که در خواب خروپف زیادی بکند همچو حیوانی که تازه ذبح شده است.]

**دەڵێی سەرخۆشە:** واتە ١) ئاگای لە خۆی نییە، هوشیار نییە ٢) بە یەکێك دەڵێن بەم لا و لادا بکەوێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [١) کسی که هوشیار نیست، ٢) کسی که به این طرف و ان طرف بیفتد.]

**دەڵێی سەری پێوە نییە:** ١) بە یەکێك دەوترێ

کە بێدەنگ و کڕ و مات بێ. ٢) بە یەکێکی گوێ رایەڵی، پێزان دەوترێ کە هەمیشە لە خزمەتدا بێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [١) به کسی گفته می‌شود که بی‌صدا و خاموش و غمگین باشد. ٢) به کسی گوش به فرمان و آگاه گفته می‌شود که همیشه در خدمتت باشد.]

**دەڵێی سەری لە لای شایەوە هاتووە:** [بە یەکێکی ئاوارە و بادی هەوا و فیزن دەڵێن]. **ف** به کسی سرگردان و خودپسند و متکبر گویند. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٩)*

**دەڵێی سەگ ـ کەر ـ تۆپیوە:** [بە جێگایەك ئەڵێن کە بۆنی ناخۆشی لێوە بێت یان کەلاکی تۆپیوی تێدا بێت]. **ف** به فضایی گفته می‌شود که به بوی بدی آلوده شده باشد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .١٩٩)*

**دەڵێی سەگە (سەگی گەڕە):** ١) لە ناشیرینیدا ٢) لە پیسیدا. بە رقەوە بە یەکێك دەڵێن کە ناشیرین یا پیس بێت و حەز لە چارەیشی نەکەن. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [١) در زشتی ٢) در کثیفی از روی کینه و نفرت کسی را به آن تشبیه می‌نمایند که زشت و کثیف باشد و از او بیزار باشید.]

**دەڵێی سەگەو بە مانگەشەو دەوەڕێت:** دەڵێن: وابزانە سەگەو بە مانگەشەو دەوەڕێت واتە: گوێ مەدەرە ئەو بێ شەرم و شکۆیە کە ئەو قسە ناشیرینانە دەکا = بە یەکێك دەوترێت کە بە خراپە ناوی پیاوێکی باش بەرێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [گویند: اینطوری تصوّر کن که سگ است به ماه عوعو می کند. یعنی: گوش فرا مده به آن شخص بی‌شرم و شکوه که سخنان زشت می گوید. به شخصی گفته می‌شود که از بزرگان و نیک مردان به بدی یاد بکند.]

**دەڵێی سەگساره:** سەگسار= سەگێکی ناشیرینی ئەفسانەییە بە یەکێکی زۆر ناشیرین دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [سەگسار سگی زشت افسانه‌ایی است و به کسی که چهره‌ی زشتی داشته باشد گفته می‌شود.]

**دەڵێی سەگی (گورگی) پێ سووتاوە:** واتە جێ نایگرێتە خۆی، سرەوتی نییە، هەر لە خوێرییەتی و هاتووچۆدایە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [در هیچ جای آرام و قرار ندارد. همیشه بیکار و در رفت و آمد می‌باشد.]

**دەڵێی سەگی ‹کونە ماسییە› و پاسی ‹جرتاوا› دەکات:** ١) بۆ سووکی بە یەکێ دەڵێن کە لە خۆیەوە لەسەر لایەك بکاتەوە دژی لایەکیتر. ٢) کاری لای خۆی جێ بە

جێ ناکات، کوێخایی شوێنیتر دەکا. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [١) برای رسوایست بە کسی گفتە می‌شود کە از طرفی جانب‌داری بکند و برضد طرف دیگر عمل بکند. ٢) کسی کە توانایی کار خود را ندارد و در کار دیگران دخالت می‌کند.]

**دەڵێی سەگی برسییە:** بە یەکێك دەڵێن کە چاو بە هەر چوارلادا بگێرێت، هەڵپەی شتێکی بێت کە هەواڵی بیستبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [بە شخصی گویند کە همە جا را بپاید و در نظر بگیرد و عجلەی خوردن چیزی را داشتە باشد کە خبری از آن شنیدە است.]

**دەڵێی سەگی دەرماڵە:** واتە بە هەموو کەسێك دەگەفێ، ئەوەڕی. بۆ چاك و خراپ دەم شڕ و بێ حەیایە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٦)* **ف** [بە همە کس پارس می‌کند. خوب و بد را نمی‌شناسد نسبت بە همە بددهن و بی‌شرم است.]

**دەڵێی سەگی سەرملەیە:** بە یەکێکی زمان پیسی بێ شەرم دەوترێت کە پەلاماری هەموو کەسێك بدات و ڕێ لە هەموو کەس دەگرێت، وەك چۆن سەگی سەرملە بە هەموو لایەکی کێوەکە دەگەفێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [بە شخصی بد زبان و بی‌آبرو گفتە می‌شود کە بە همە کس بپرد و حملە کند. مانند سگ سرگردنە است بە همەی اطراف کوە پارس می‌کند.]

**دەڵێی سەگی ناوگەنمە:** لە ڕووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێ کە لەبەر فیز و خۆبەزل زانین، لووتی خۆی بەرز بگرێت. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٦)* **ف** [از روی رسوایی بە کسی مبتکر و خودخواە گفتە می‌شود.]

**دەڵێی سەگی هارە:** بە یەکێکی بێحەیای شەرەنگێز دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٦)* **ف** [بە شخصی بی‌شرم و فتنەانگیز گفتە می‌شود.]

**دەڵێی سەگی هەڵە پاسە (هەڵە پاچە):** ١) بە یەکێکی دڕی بێحەیا دەوترێت. ٢) بە جێی دوژمن لە دۆست دەوەڕێ. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [١) بە شخصی نترس و بی‌شرم گفتە می‌شود. ٢) کسی کە بە جای دشمن بە دوست حملەور است.]

**دەڵێی سەگی هەوشارە:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر دڕ و شەڕەنگێز بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٠)* **ف** [بە شخصی بسیار نترس و فتنەانگیز گفتە می‌شود.]

**دەڵێی سەلکە ترخێنە دەچنێتەوە:** بە یەکێك دەڵێن کە ماڵانگەڕ بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣١)* **ف** [بە شخصی ولگرد گفتە

می‌شود.]

**دەڵێی سەوڵی خەرامانە:** وتەیەکە بە ژنی شۆخ دەوترێ. سەوڵی خەرامان گیایەکی سووری بەرز و جوانە لە ناو بێستانا سەوز ئەبێ و لە دوورەوە سەرنج رادەکێشێ. (وەك گسك وایە، رەنگی سوور و بنەوشە) *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [سخنی است که به زنی زیبا و شیک گفته می‌شود. سرو خرامان درختچه‌ی زیبایی است که در بوستان‌ها کاشته شده، از دور چشم را خیره می‌کند.]

**دەڵێی سەیی (سەگی) بەورە (بەفرە) رۆژە:** بە یەکێك دەوترێ کە جێ‌بەخۆی نەگرێت و کەوتبێتە هاتووچۆ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که آرام و قرار نداشته باشد و شروع به رفت و آمد بکند.]

**دەڵێی سەیی (سەگی) تەنیاماڵەیە (ماڵە):** لە رووی سووکیەوە بە یەکێك دەڵێن کە بە تاقی تەنیا جۆین و قسەی ناشیرین بە خەڵکی بدات و بڵێت. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [از روی رسوایی به کسی گفته می‌شود که تک و تنها فوش و ناسزا به مردم بدهد.]

**دەڵێی سپلی لاورگە:** بە یەکێکی گرانجانی دەستهەڵنەگر ئەڵێن. **ف** بە کسی جان سخت و مزاحم که دست‌بردار نباشد گویند.

**دەڵێی سلقی رووتە:** بە یەکێکی رووت و رەجال دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [به کسی فقیر گفته می‌شود.]

**دەڵێی سن هەڵی مژیوە:** زەرد و لاواز بووە، پووکاوەتەوە. وەك ئەو گەنم و دانەوێڵەیەی سن شیلەکەی دەمژێ و دەیپووکێنێتەوە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [مانند آن گندم و ماشی است که حشره‌ی سن شیره‌ی آن را می‌مکد و نابودش می‌کند.]

**دەڵێی سیرمە (چەرمە) رەقە:** زۆر لاوازە پێستەکەی بەسەر ئێسکەکەیدا وشك بۆتەوە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷٦)* **ف** [به حدی لاغر است که پوستش به استخوانش چسبیده است.]

**دەڵێی شاپان شپلەکوتە:** بە یەکێکی جرپنی سەر و قژ بژ دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۷)* **ف** [به کسی بازیگوش و ناآرام که سری با موهای سیخ شده داشته باشد، می‌گویند.]

**دەڵێی شای جنۆکانە:** بە یەکێك دەوترێ کە بەرگێکی سەیری لەبەر کردبێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۷)* **ف** [ب کسی گفته می‌شود که لباس تعجب‌آوری پوشیده باشد.]

**دەڵێی شەقولقەمەری کردووە:** بە یەکێك دەوترێ وا بزانێ کارێکی زۆر گرنگی کردووە. (جلال محمود بەرگی ۲. ۷۷) ف [به کسی گفته می‌شود که این‌طور تصور کند که کار بسیار مهمی را انجام داده باشد، اگرچه این‌طور هم نباشد.]

**دەڵێی شەلاقەی باڵ شکاوە:** جۆرە باڵندەیەکی گۆشتخۆرە. بە یەکێك دەڵێن کە خوار و خێچ وەك شەل و گێڕ بڕوات. بە مەردومی شلەپەتە دەوترێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۲) ف [نوعی پرنده‌ی گوشتخوار است به شخصی کج و کوله و لنگ گویند یا به انسان نامرتب و سست گفته می‌شود.]

**دەڵێی شەیتان دەرسی داداوە (تفی کردۆتە دەمی):** واتە: فێڵباز و زۆرزان و زیرەکە، وەك شەیتان. بە تایبەتی بە منداڵێك دەڵێن کە زۆرزان بێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۲) ف [حقه‌باز و بسیار دانا و زیرک است، مانند شیطان. به خصوص به بچه‌ای گفته می‌شود که بسیار دانا باشد.]

**دەڵێی شەیتان راوی دەنێت:** بە کەسێك دەڵێن کە زۆر بە گوڕ بڕوات. چونکە شەیتان لە لای موسوڵمان شتێکی ترسناك و رەزاتاڵە، ئەو کەسە بە جۆرێك رادەکات هەرگیز شەیتان نەیگرێتەوە. (جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۲) ف [به کسی گفته می‌شود که بسیار باعجله برود. چون شیطان پیش مسلمان موجودی ترسناک و دوست نداشتنی است آن شخص طوری فرار می‌کند که هرگز شیطان به او نمی‌رسد و او را نمی‌گیرد.]

**دەڵێی شڕەی بەرتۆپەکەیە:** بە یەکێك رووت و ڕەجال دەوترێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۳) ف [به شخصی ندار و تنگدست گفته می‌شود.]

**دەڵێی شووتی بۆ نەخۆش هێناوە:** [جۆرێ خۆی پیشان ئەدا دەڵێی مافێکی گەورەی بەسەر کەسانیترەوە هەیە]. ف طوری رفتار می‌کند مثل اینکه حق بزرگی به گردن دیگران دارد. (فتاحی قاضي بەرگی۱. ۲۰۰)

**دەڵێی شێرە کوللەیە:** بە یەکێکی لەڕی باریك دەوترێ. (جلال محمود بەرگی۲. ۷۷) ف [به انسانی لاغر و بلندقد گفته می‌شود.]

**دەڵێی شێرە:** واتە زۆر ئازا و بەجەرگە. (جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۳) ف [بسیار شجاع و نترس است.]

**دەڵێی شێلم شەو پاتەیە:** واتە وەك شێلمێك شەو بمێنێتەوە وا ناخۆشە. (جلال محمود بەرگی ۲. ۷۷) ف [مانند شلغمی است که شب مانده باشد و بدمزه شود.]

**دەڵێی چاوی قرژاڵە (قرژانگە):** بە ئاوێک دەڵێن کە زۆر ساف و پاك و روون بێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٤)* **ف** [بە آبی بسیار شفاف و روشن و پاک گویند.]

**دەڵێی چەرمی ئاوە سووە:** بە یەکێك دەوترێ کە بێعار بێ. هەرچی بەسەر بێ دەربەست نەبێ، بەرگەگر و قایم بێت یان هەرچی پێ بڵێن نەیگرێتە خۆی و پێی تێك نەچێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ٧٥)* **ف** [به کسی بی‌شرم گفته می‌شود که هرچه بر سر او بیاید مقید نباشد و مقاوم بوده و هرچه به او بگویند نگران نشود و به روی خویش نیاورد.]

**دەڵێی چەقەڵە ـ چەقەڵە دیمییە (رێوییە):** بە یەکێکی سیسی لەڕ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٤)* **ف** [به شخصی نحیف و لاغر گویند.]

**دەڵێی چرایە:** [جوان و پرتیشك و بە شەوقە]. **ف** زیبا و درخشان و شاداب. *(فتاحی قاضی بەرگی ١. ١٩٧)*

**دەڵێی چوالووە:** بە یەکێکی قەڵەوی تێرگۆشت دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٤)* **ف** [به شخصی چاق و تنومند و پرگوشت گویند.]

**دەڵێی چێرگە:** [١) بەو بۆنەوە ئەڵێن کە گۆیا پەلەوەرەکە قەڵەوە. ٢) بە کەسێکی پان و پۆڕ و قەڵەو دەڵێن]. **ف** ١) برای خاطرنشان کردن چاقی طیور گفته می‌شود. ٢) به شخص تپل و چاق و چله گویند. *(فتاحی قاضی بەرگی ٢. ١٢٧)*

**دەڵێی چیکەنەیە:** چیکەنە = مەکینەیەکە لۆکە لە پەموانە جیا دەکاتەوە. واتە: زۆر بلێیە و دەمی هەر لە کاردایە و ناوەستێ. *(جلال محمود بەرگی ١. ٤٧٥)* **ف** [بسیار پرحرف است لحظه‌ای از حرف زدن باز نمی‌ایستد.]

**دەڵێی گۆچانی قووت داوە:** [واتە: ملێکی گێڕ و وێڕی هەیە]. **ف** گردن کج و معوجی دارد. *(فتاحی قاضی بەرگی ١. ٢٠١)*

**دەڵێی گازلی ئەحمەد عەربەبییە:** بە یەکێکی زلی قەبەی تەمەڵ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٨)* **ف** [به شخصی ناهموار و ناهنجار و تنبل گفته می‌شود.]

**دەڵێی گازیان لێگرتووە:** [١) تۆراوە و ناڕازییە] [٢) لاواز و بێهێزە]. **ف** ١) حالت قهر و نارضایتی دارد. ٢) لاغر و بی‌حال است.

**دەڵێی گای بنەیە:** واتە نابزوێت و جێ ناگۆڕێت. *(جلال محمود بەرگی ١. ٢٢٨)* **ف** [حرکت نمی‌کند و جایش را عوض نمی‌کند.]

**دەڵێی گای تۆڕ تێی هەڵهاویشتووە:** بە یەکێ دەوترێ کە زۆر پەشۆکا بێ، ترس دایگرتبێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٨) ف [بە کسی گفته می‌شود کە آشفته باشد و ترس او را فرا گرفته باشد.]

**دەڵێی گای حەسەن تەمزە:** بە یەکێکی قەبەی پۆر خزی سست و تەمەڵ دەوترێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٨) ف [بە شخصی ناهموار، ناهنجار و تنبل گفته می‌شود.]

**دەڵێی گەرووی تەنەکەی تێگیراوە:** بە کەسێ دەڵێن کە چا بە گەرمی بخواتەوە گەرووی بەو گەرمیە نەزانێ، بە تەنگ ئەو گەرمییەوە نەیەت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٨) ف [بە کسی گفته می‌شود کە چای را بە داغی بنوشد و گلوی او دربند و مقید این داغی نباشد.]

**دەڵێی گەمیەکەی نوقم بووە:** [پەرێشان و دڵ پڕ لە خەمە]. ف غمگین و پریشان است. (فتاحی قاضی بەرگی١ .٢٠٢)

**دەڵێی گزگلە:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بچووك و خر بێت بە تایبەتی منداڵ دەوترێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٨) ف [بە شخصی بسیار کوچک و کوتاه قد مخصوصاً بە بچەها گفته می‌شود.]

**دەڵێی گزیرە:** بە یەکێك دەڵێن کە لە خۆیەوە هەڵ بداتێ و دەست بخاتە کاری خەڵکەوە. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٨) ف [بە شخصی کە سرخود و بی‌مقدمە در کار دیگران دخالت کند.]

**دەڵێی گورە و شاردراوە (دریاگە):** بە یەکێك ئەڵێن کە تێ قوپا بێت و زەرد هەڵگرابێت، چاوی بە قووڵدا چووبێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٨) ف [بە شخصی تکیدە و لاغر کە چهرەاش بر زردی گراییدە باشد گفته می‌شود و نیز بر اثر ضعف چشمانش بە گودی افتادە باشد.]

**دەڵێی گورچیلەی (وڵك) گان بە یەکەوە نانووسێن:** بە چەند کەس دەوترێت کە پێکەوە هەڵکردنیان نەبێت و هیچیان بە هیچانەوە نەنووسێن. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٨) ف [بە چند نفر گفته می‌شوند کە با هم نسازند بە توافق نرسند.]

**دەڵێی گورگە:** واتە وەك گورگ ١) چابوکە ٢) ناپاکە. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٩) ف [١) مانند گورگ چالاک و زرنگ است ٢) ناپاک است.]

**دەڵێی گورگی پێ سووتاوە:** جێ بە خۆی ناگرێ، سرەوتی نییە، هەر لە خوێرییەتییە. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٨) ف [در جایی آرام و قرار ندارد و در بیکاری بە سر

می‌برد.]

**دەڵێی گورگی سووتەمەڕۆیە:** بە یەکێ دەڵێن کە لە رووی دیمەنەوە نابووت و ناشیرین بێت. (جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸) ف [بە کسی گفته می‌شود کە از لحاظ ظاهر لاغر و بدقوارە و زشت باشد.]

**دەڵێی گورگی کوشتووە:** هیچی نەکردووە کە چی خۆی وا نیشان دەدا کە زۆر برسی و ماندووە (جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸) ف [هیچ کاری را انجام ندادە و طوری وانمود می‌کند کە بسیار گرسنە و خستە است.]

**دەڵێی گوللەی لە زمانی دراوە:** [بە کەسێك ئەڵێن کە نەیەوێت و هەوڵ نەدا جوان و رەوان قسە بکا]. ف بە کسی گفتە می‌شود کە نکوشد خوب و فصیح صحبت کند. (فتاحی قاضي بەرگی۱ .۲۰۱)

**دەڵێی گولی بەخیلە:** بە یەکێکی دڵ پیسی بەخیل دەڵێن کە زۆر بەرچاو تەنگ بێت و هیچ شتێك بە هیچ کەسێك نەدات و هیچ یارمەتی کەس نەدات. (جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۰) ف [بە شخصی بدگمان و حسود گفتە می‌شود کە بسیار خسیس باشد و هیچ چیزی را بە دیگران ندهد و حاضر بە هیچ نوع کمکی بە دیگران نباشد.]

**دەڵێی گولی دووریاواییە:** بە یەکێك دەڵێن کە تەریك، دوور لە کۆمەڵێك دانیشتبێت. ئاشکرایە کە گول دوور دەخرێتەوە تا کەسی لێوە تووش نەبێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۰) ف [بە کسی گفتە می‌شود تنها و بی‌نصیب و بە دور از جمعی نشستە باشد قبلاً رسم بر این بود کە جذامی را بدور از مردم نگاە می‌داشتند تا دیگران بە بیماری او مبتلا نشوند.]

**دەڵێی گوێز دەکاتە هەمانەوە:** واتە: لای ئەو وایە کەس ئاگای لە کاروباری نییە هەروەهاش کارەکەی ئاشکرا و نەشارراوەیە. (جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۰) ف [او اینطور فکر می‌کند کە کسی از وضعیت او خبر ندارد در حالیکە کارش بر کسی پوشیدە نیست.]

**دەڵێی گـویزە، بـاری بۆنییـە:** بە یەکێکی چەوتی ناڵەبار دەوترێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۰) ف [بە شخص کج‌رفتار و کج‌اندیش و ناباب گفتە می‌شود.]

**دەڵێی گوێزی ناو دەخیلەیە:** بە یەکێکی زۆر بچکۆلانە، یان بە یەکێکی زۆر بچووك و زرنگ و زیت دەوترێت. (جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۰) ف [بە شخصی بسیار کوچک و زرنگ گفتە می‌شود.]

**دەڵێی گیای بە کێوەوە خواردووە:** واتە: وەك

ئاژەڵـە و تێگەیشـتنی نییـە. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۱)* **ف** [مانـنـد حیـوان اسـت و چیزی نمی‌فهمد.]

**دەڵێی گیپەی جۆیە:** بە یـەکێکی زۆر قەڵـەوی خڕ دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۱)* **ف** [به کسی چاق و کوتاه قد و کوتوله گفته می‌شود.]

**دەڵێی گیسگە دێیە:** بە یەکێك دەوترێت کە بۆ ملێ و مۆش سەر بە هەموو شوێنێکدا بکات. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۱)* **ف** [بـه کسـی گویند که برای پیدا کردن غذا به هر خانـه سر بزند.]

**دەڵێی گیسکی ئاوەکییە:** گیسـکی ئـاوەکی ئەوەیە لە ران دوور کەوتووە و تەرە بووە. بـە یەکێك دەڵێن کـە سـەر بـە هـەموو لایەکـەوە بنێت و بەم لا و لادا زۆر بڕوات. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۱)* **ف** [بز غالەای است که از گله خود دور افتاده و آواره شده است. به کسی گفته می‌شود که به هر جانب سر بکشد و زیاد به این طرف و آن طرف برود.]

**دەڵێی گیسکی پرسانەیە:** لەڕ و لاوازە، ئایەخ بۆ پرسـە دەبـەن. *(جلال محمود بەرگی۲. ۷۸)* **ف** [گویند لاغر و ضعیف است.]

**دەڵێـی گیسـکی سـەلەمە ـ گیسـکی قەرزارگرتووە:** بە یەکێکی نابووتی بچکۆلانە دەڵـێن، بـێ دەق و سـیس و کەنەفتـە. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲٤۱)* **ف** [به کسی کوتاه قـد و زشت گفته می‌شود که پریشان و پژمرده باشد.]

**دەڵێی عەجاییاتییە:** بە یەکێك، بە منداڵێك دەڵێن کە هاروهاجی بکات، یان ناشیرین بێت واتە سـەیر و سـەمەرەیە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۷)* **ف** [به کسی یا بچه‌ای گفته می‌شود کـه نـاآرام و بـازیگوش یـا زشـت و شگفت‌انگیز باشد.]

**دەڵێـی عەجنەیـە:** عەجنـە زینـدوەرێکی ئەفسانەییە. واتە زۆر ناشیرینە. *(جلال محمود بەرگی۲. ۷٦)* **ف** [بـه کسـی بسـیار زشـت گویند.]

**دەڵێی عیسا گرتوویە و مووسا تێـی ئـاخنیوە:** بـە یـەکێك دەوترێـت کـە لـە قەڵەویـدا ڕەوابێتـەوە. *(جلال محمود بەرگی۱. ۲۳۳)* **ف** [به کسی بسیار چاق گویند.]

**دەڵێی فەرهادە:** [لە ئیش و کار ماندوو نابێ، هێزی کـارکردنی زۆرە. بـە ئیشـتیا و حـەزەوە کار دەکا]. **ف** از کار کردن خسته نمی‌شود. با عشق کار مـی کنـد. *(فتاحی قاضی بەرگی۲ ۱۲۹)*.

**دەڵێـی فیڕنـە گولەیـە:** واتـە زۆر بچـووك و ڕیوەڵەیە. فیڕنەگولە: باڵندەیەکی بچووکە لـە

چۆلەکە بچووکترە. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٣) **ف** [بسیار کوچک و لاغر و ضعیف و مردنی: فیرِنه گوله = پرندەای است که از گنجشک کوچک‌تر است.]

**دەڵێی فیشەکە شێتەیە بە ئاسماندا (بە حەوادا دەچێت)**: بە یەکێك دەڵێن کە زۆر تووڕەبێت و هەر لە خۆیەوە هەڵچێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٤) **ف** [به کسی گفته می‌شود که بسیار عصبانی باشد و بی‌علت و بیهوده خشمگین شود.]

**دەڵێی فیلە**: بە یەکێکی قەبەی زلە دەڵێن. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٤) **ف** [به شخصی ناهموار و قوی هیکل گویند.]

**دەڵێی قاژووی رەشە**: بە یەکێك دەڵێن کە پێستی رەش و رەقەڵە و لەرِیش بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٤) **ف** [به کسی گویند که پوستش سیاه و لاغر باشد.]

**دەڵێی قارچکە و هەڵتۆقیوە**: بە یەکێکی قەڵەوی گووپن دەوترێ، بەتایبەتی کە زوو پێ بگات. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٧) **ف** [به شخصی چاق و لپ برجسته گفته می‌شود که مخصوصاً زود رشد کرده باشد.]

**دەڵێی قازی کوێرە**: بە یەکێك دەڵێن کە بەتەنیا بێت، یان بە تەنیا مابێتەوە. (جلال محمود بەرگی١. ٢٢٤) **ف** [به کسی گویند که تک و تنها باشد.]

**دەڵێی قالۆرەی سووتاوە**: لاواز و رەش و بالآبەرزە. بەرز هەڵچووە. (جلال محمود بەرگی ٢. ٧٧) **ف** [لاغر و سیاەچرده و بلند قد و کشیده است.]

**دەڵێی قاوت کراوەتە دەمی**: بە یەکێك دەڵێن کە بێدەنگ دانیشتبێت و هیچ قسەیەك نەکات وەك نەوێری دەم بکاتەوە. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٧) **ف** [به کسی گفته می‌شود که آرام و بی‌صدا نشسته باشد و هیچ سخنی نگوید مانند این که جرأت سخن گفتن نداشته باشد.]

**دەڵێی قایشی هەمەدانییە**: [رەنگ و پێستی تاریك و رەشە]. **ف** رنگ و پوستش تیره و سیاه است. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٢٩)

**دەڵێی قەرەچی پشتی کەرە**: [بە کچۆڵەیێکی بێشەرم و رووداماڵراو ئەوترێ]. **ف** به دختربچەای جسور و بی‌حیا گفته می‌شود. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .١٨٩)

**دەڵێی قەفنەجنۆکەیە**: واتە زۆر بچووکە، بۆ جێگەیەکی تاریك و تەسك ئەوترێ. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٧) **ف** [بسیار کوچک است. به جای تاریک و کم‌وسعت گویند.]

**دەڵێی قەلای سیواستە پۆلیی گرتووە**: [بە یەکێکی فیزن و بایی هەوا یان خۆ بەزلزان

دەڵێن]. ف غرور و افادەی زیادی پیدا کرده است. (فتاحی قاضی بەرگی١. ٢٠٠)

**دەڵێی قەڵای مەریوانی گرتووە:** وەك ئەوەی پێشوو.

**دەڵێی قەندەی دەم بەرەوژوورە:** بە یەکێك دەوترێت کە بۆ هەرلایەك بچێت خواردنی بە تووشەوە بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٤) ف [به کسی گفته می‌شود که به هر جایی برود با خوردن غذا مواجه شود.]

**دەڵێی قوڕ بە دەمیدا دراوە:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر کرِوبێ دەنگ بێت، هەر وەك دەمی بە قوڕ سواخ درابێت. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٤) ف [به کسی بسیار بی‌صدا و آرام گویند که گویی دهانش را گل اندود کرده باشند.]

**دەڵێی قومقومۆکەیە:** بە یەکێکی بچووکی نابووت دەوترێ بە تایبەت بە منداڵ. جانەوەرێکە لە مارملێك دەچێت و لەو گەورەترە، لە ئەفسانەی کوردیدا دەڵێن: گوایا لەو کاتەدا کە حەزرەتی ئیبراهیمیان خستۆتە نێو ئاگرەکەوە تا بسووتێت، قومقومۆکە فووی لە ئاگرەکە کردووە خۆشی کردووە. بۆیە بە جانەوەرێکی خراپ دەزانرێت وا لە قەڵەم دەدرێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٧) ف [به شخصی کوچک و لاغر و بدقواره گفته می‌شود بخصوص برای بچه‌ها به کار می‌رود. قومقوموکه: جانوری است شبیه به مارمولک و اندکی بزرگ‌تر. در افسانه‌های کردی این‌طور نقل کرده‌اند که وقتی حضرت ابراهیم را در آتش می‌اندازند تا بسوزد این جانور به آتش پف می‌کند تا شعله‌ور شود، به این دلیل است که او را جانوری بد قلمداد می‌کنند.]

**دەڵێی کۆڵە هێلکەی هێناوە:** واتە کارەکەی بێ‌کەڵکە و ناز و نووزیش دەکا. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٨) ف [کارش بی‌سود است و عشوه و ناز هم می‌کند.]

**دەڵێی کۆڵەوژی جەهەنەمە:** بە یەکێکی رەقەڵەی رەش داگەڕاو دەوترێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٨) ف [به کسی لاغر و سیاه چرده گفته می‌شود.]

**دەڵێی کاروانسەرایە:** بە شوێنێکی قەرەباڵغ دەوترێ کە خەڵکێکی زۆری تێ چڕابێت. (جلال محمود بەرگی٢. ٧٧) ف [به جای شلوغی گویند که جمعیت زیادی در آن رفت و آمد کنند.]

**دەڵێی کاسەی چەورە:** بە یەکێك دەوترێت کە هیچ نەگرێتە خۆی واتە: چەرداوەڕو و بێ عارە. (جلال محمود بەرگی١. ٢٣٤) ف [به

کسی بی‌شرم و بی‌آبرو گفته می‌شود که مقید و در بند چیزی نباشد.]

**دەڵێی کایە ـ کا دەخۆم:** واتە خواردنەکە تام و چێژی نییە. خۆش نییە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸)* **ف** [خوش‌مزه نیست.]

**دەڵێی کایە:** [تامێکی خۆشی نییە]. **ف** طعم مطبوع ندارد. غذای نامطبوع. *(فتاحی قاضی بەرگی ۱. ۲۰۰)*

**دەڵێی کەر بە ئاشدا دەکات:** واتە بە دەنگی بەرز قسە دەکات و کردوویە بە گاڵەگاڵ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸)* **ف** [با صدای بلند صحبت می‌کند و شروع به سر و صدا کرده است.]

**دەڵێی کەر بە لووتێدا تسیوە:** بە یەکێکی مۆن و گرژ دەوترێ کە هەمیشە وا بێت. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸)* **ف** [به کسی اخمو و افسرده گفته می‌شود.]

**دەڵێی کەر لە پەموو دەردەکا:** بە یەکێکی بێبەزەیی دەوترێ کە بە هەموو هێزیەوە بە یەکێکدا بپلۆسێت یان لە ماڵاتێك بدات. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸)* **ف** [به کسی بی‌رحم گفته می‌شود که با تمام قدرت کسی یا حیوانی را کتک‌کاری کند.]

**دەڵێی کەرە دەترێت (...):** واتە نەزانە، قسەی ناشیرین بەرووی پیاو دادەکات. *(جلال محمود بەرگی ۱. ۲۳۵)* **ف** [یعنی نادان است و در مقابل دیگران سخنان ناشایست می‌گوید.]

**دەڵێی کەرە لە جۆی زیز بووە:** [بە کەسێك دەڵێن لەخۆوە مانی گرتبێ و لە شتێك لووتی کردبێ]. **ف** کسی که بی جهت لج کرده، مثلاً به غذایش لب نزند.

**دەڵێی کەرەواڵەیە:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بێدەنگ و نەدوو بێت، وەك زمانی لە دەمدا نەبێت، وا بێت. کەرەواڵە= باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە. *(جلال محمود بەرگی ۱. ۲۳۵)* **ف** [به کسی بسیار بی‌صدا و ساکت گفته می‌شود که انگار زبان در دهان نداشته باشد. کەرەواڵە= بلدرچین پرنده‌ای است از گنجشک بزرگ‌تر است.]

**دەڵێی کەری حەرامە:** بە یەکێك دەوترێ کە بێقسە و سڵاو، سەری خۆی داخا، بەلای کۆڕ و کۆمەڵێکد تێپەڕێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۸)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که بدون سلام و احوالپرسی، سر خود را پایین انداخته بدون سر و صدا در کنار جمعی عبور کند.]

**دەڵێی کەری دێزە (کەری دێزگە):** وا باوە کەری دێز لە کارواندا کوێ سەخت و هەڵەت و پڕمەترسی بێت بە وێدا دەڕوات. دەڵێن: وەك کەری دێزە تۆپینی خۆی و زیانی خاوەنی

دەوێت. ئەمە بە یەکێك ئەڵێن کە بیر نەکاتەوە بەدەربەسەوە نەیەت، خۆی و ئەوانەی پەیوەندییان پێوەی هەیە، بە کرداری ئەو زیانیان لێ بکەوێ. *(جلال محمود بەرگی ۱ . ۲۳٥)* **فـ** [رسم و عادت بر این است که خر نحس همراه کاروان از هر جایی که دشوار و پر از خطر باشد عبور می‌کند. گویند مانند خر نحس است مردار خویش و ضرر صاحبش را می‌خواهد. این به کسی گفته می‌شود که نیندیشد و در بند خود و دیگران نیز نباشد و به وسیلەی اعمالش، خود و اطرافیانش را دچار ضرر و زیان می‌سازد.]

**دەڵێی کەری چەرچیانە (چەرچییە):** بە یەکێك دەوترێ کە سەر بەم‌ماڵ و بەوماڵدا بکات *(جلال محمود بەرگی ۲ . ۷۷)* **فـ** [به کسی گفته می‌شود که بدون جهت و دلیل به این منزل و آن منزل آمد و شد داشته باشد.]

**دەڵێی کەری کاروانییە:** بە یەکێك دەڵێن کە تەمەڵی بکا. لە رووی سووکییەوە وای پێ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی ۲ . ۷۸)* **فـ** [به کسی که تنبلی کند گویند از روی رسوایی و بی‌آبرویی به او گفته می‌شود.]

**دەڵێی کەشکی ئاوەسووە:** شتێك کە زۆر لە ژێر ئاودا بمێنێتەوەو ئاوی بەسەردا بڕوات لیك ولووس دەبێت. دەڵێن ئاوەسوو بووە واتە: ئاوەسوویەتیەوە واتە: ۱) ئەو کەسە بێچاوڕو و بێ شەرمە، چەقاوەسووە ۲) چاوەنەترس و چاوقایمە. گەرم و سارد چەشتووە. *(جلال محمود بەرگی ۱ . ۲۳٥)* **فـ** [چیزی که زیاد زیر آب بماند و آب بر رویش جاری باشد سائیده و صاف خواهد شد. یعنی: ۱) شخص بی‌شرم و شرلاتان ۲) دلیر و بیباک و نترس. دوران دیده و باتجربه.]

**دەڵێی کەڵە شێری بلقاسمە:** بلقاسم (ابوالقاسم) ناوێك بووە، کەڵەشێرێکی دڕی بووە، بەم و بەودا هەڵپژاوە و شەڕانی بووە. بە یەکێك دەڵێن کە هەر لە خۆیەوە لە هەموو هەڵوێستێکدا خۆی قوت بکاتەوە، بێ ئەوەی کەس پرس و راوێژی پێ بکات. بە یەکێك دەڵێن کە لە قسەی ئەم و ئەودا تێ هەڵکات. *(جلال محمود بەرگی ۱ . ۲۳٦)* **فـ** [ابوالقاسم شخصی بوده که خروسی جنگی و نترس داشته است که به این و آن می‌پریده و ستیزەجو بوده است. به کسی گفته می‌شود که بیهوده و بی‌دلیل دربارەی هر کاری موضع خویش را ابراز دارد. بدون این که کسی سؤالی از او بپرسد یا با او مشورتی

بکند یا کسی است که در برابر سخن این و آن فریاد سر می‌دهد.]

**دەڵێی کەڵەبابی بێوەختە:** [بە یەکێك ئەوترێ کە ناوەخت بڕواتە جێگایەك. یان کەسێك کات و شوێن نەناسێ و لە خۆیەوە قسە بکات]. **ف** به کسی گفته می‌شود که بدون وقت قبلی و سرزده به جایی برود. شخصی که زمان و مکان را نشناخته، سخن بیجا سر دهد. *(فتاحی قاضی بەرگی۲ ١٣٠)*

**دەڵێی کەڵەشێری کلك هەڵکێشراوە:** بە یەکێکی بچووکی بێ نموود دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٦)* **ف** [به شخصی کوتوله و ناچیز اما لاف‌زن گفته می‌شود.]

**دەڵێی کەللەی شەکرە (شەکەرە) ـ زمانی دەڵێی شەکرە ـ زمانی شیرینە:** قسەی خۆشەومرۆڤێکی ناسکە، لەگەڵ خەڵکدا جوان و بەرێزانە دەدوێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٦)* **ف** [انسانی خوش‌گفتار و خوش برخورد و با مردم برخوردی احترام‌آمیز دارد.]

**دەڵێی کەندووی نەزانکردە:** بە یەکێکی زلی قەبەی ناشیرین، خوار و خێچ دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٦)* **ف** [به شخصی ناهموار، زشت و کج و کوله گفته می‌شود.]

**دەڵێی کەوان دەگرێ:** زۆر لەسەرخۆ و بەپارێز دەڕوات. بە هۆشیارییەوە هەنگاو هەڵدەگرێ. *(جلال محمود بەرگی۲. ۷۸)* **ف** [بسیار آرام و بااحتیاط قدم برمی‌دارد.]

**دەڵێی کەوباری دەستی چەور پێوە دراوە:** بەچکە کەوە، کە لەگەڵ دەستی چەوری تێوەردرا، پەکی دەکەوێت. بە یەکێکی کز و هەژار دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی۲. ۷۸)* **ف** [مانند جوجه کبک است هرگاه دست چرب به او بزنی درمانده می‌شود. به شخصی لاغر و بیچاره گفته می‌شود.]

**دەڵێی کەوی بنێشتە (داجکە) تاڵ خواردووە:** بە یەکێك دەوترێت کە دەنگی زوڵاڵ بێت. چونکە وا باوە بنێشتە تاڵ دەنگ خۆش دەکات. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٧)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که صدای صاف و جذاب داشته باشد چون بر این باور بوده‌اند که سقز تلخ صدا را سالم و بهبود می‌بخشد.]

**دەڵێی کرمی کۆمە:** واتە باریك و ڕیوەڵە و سیسە بە تەوس و گاڵتەوە دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٣٧)* **ف** [از روی شوخی و طعنه به شخصی لاغر اندام و باریک گفته می‌شود.]

**دەڵێی کرێشەیە:** [پارچەی پەسەندکراو و سەرنجڕاکێشە]. **ف** پارچەی مرغوب و زیبایی است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ . ٢٠٠)*

**دەڵێی کچە جافی بۆ دابەزیوە:** بە یەکێك دەڵێن کە لە شوێنێکدا بێت و پەلەی ماڵەوەی بێت. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٨)* **ف** [به کسی گفته میشود که در جایی باشد و عجله رفتن به منزل را داشته باشد.]

**دەڵێی کوتکی فەقیرییە:** [پتەو و بەهێزە: هەژار یان نەدار بە هیوای ئەوە کە نەدارییەکەی لە کۆڵ بکەوێ، هێز و توانێکی زۆرتر لە کاردا بەکار دێنێ]. **ف** محکم و پرزور است: فقیر به امید اینکه از فقر رهایی یابد، نیروی بیشتری در کار خود صرف می کند. *(فتاحی قاضی بەرگی٢ . ١٣٠)*

**دەڵێی کوڕ زۆکەیە:** بە یەکێکی پیر دەڵێن کە کردگاری منداڵانە بێت. هی ئەو تەمەنە نەبێ بە بێزاریی و تەوسەوە وای پێ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٨)* **ف** [به پیری گفته میشود که رفتار بچه گانه داشته باشد که مطابق با سنش نباشد. از روی بیزاری و طعنه به او گفته میشود.]

**دەڵێی کوردی بە دۆمردە:** بە یەکێك دەوترێت کە بۆ شتێك تامەزرۆ بێت. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٣٨)* **ف** [به کسی گفته میشود که آرزومند چیزی باشد.]

**دەڵێی کوڕی خاقانی چینە:** بە منداڵێك یان یەکێك دەڵێن کە لووتبەرز و بەفیز بێت. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٨)* **ف** [به بچه‌ای یا کسی متکبر و خودخواه گفته میشود.]

**دەڵێی کووپەی بێ سەروبنە:** بە یەکێك دەوترێت کە زۆر قەڵەو و خڕ و فووتێکراو بێت لە قەڵەویدا وەك کووپە، سەروبنی وەك یەك وابێت. *(جلال محمود بەرگی١ . ٢٣٧)* **ف** [به کسی بسیار چاق و کوتاه قد گفته میشود که در چاقی شبیه به خمی باشد که سروتهش مانند هم باشد.]

**دەڵێی لاکی ناوپێستەیە:** بە یەکێکی باریکەڵەی لاواز دەوترێ، بەڵام جل و بەرگی فش و فۆڵی لەبەردا بێ. *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٧٨)* **ف** [به شخصی لاغر اندام گفته میشود که لباس بیش از حد گشادی را پوشیده باشد از روی طنز و بی‌آبرویی به او گفته میشود.]

**دەڵێی لە بەدەنی خۆی دەکاتەوە:** فرۆشیارێك دڵی نەیە ترازووی شتە فرۆشراوەکەی قورستر بێ و هیچ ناخاتە سەری! *(جلال محمود بەرگی ٢ . ٧٨)* **ف** [به فروشنده‌ای گفته میشود که نخواهد پارسنگ جنس فروخته شده‌اش به تعادل برسد. یا کمی سنگین‌تر باشد.]

**دەڵێی لە بن دارێکە هیچ گەڵای پێوە نییە:** [ناهومێدی دەرەتانی لێ بڕیوە و هیوای پێ نەماوە]. **ف** دلش را یأس و نومیدی فرا گرفته است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٢٠٢)*

**دەڵێی لە ترش و خوێدا سوورکراوەتەوە:** بە یەکێکی تەندروستی قەڵەو دەڵێن کە بریسکەی روومەتی بێت. *(جلال محمود بەرگی١ .٢٤٢)* **ف** [به شخصی سالم و چاق گویند که چهره‌اش از شادابی سرخ شده باشد.]

**دەڵێی لە جووت هاتۆتەوە:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر برسی بێت و بە پەرۆشەوە بێتە سەرخواردن و بە پەلە نانەکەی بخوات. *(جلال محمود بەرگی١ .٢٤٢)* **ف** [به کسی بسیار گرسنه گویند که با دلی پر از اندوه و نگرانی دست به غذا بزند و با عجله غذایش را بخورد.]

**دەڵێی لە دەم ڕەش (گورگ بەربووە):** بە یەکێکی برسی دەوترێ کە بە هەڵپەوشپرزە و بەپەلە نانەکەی بخوا و زۆریش بخوا. دەڵێن: ئەیژی ساڵێکە نانی نەخواردووە. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٨)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که با تعجیل و شتاب و آشفتگی غذایش را بخورد گویند. انگار که سالی است غذا نخورده است.]

**دەڵێی لە دورگەی لەوەڕاوە:** [بە یەکێکی قەڵەو دەڵێن]. **ف** به کسی چاق و چله گفته می‌شود. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٢٠٢)*

**دەڵێی لە دیوی کراسیم کردووە:** [خواردنی پێخۆرم پێ خۆش نییە]. **ف** از خوردن غذا بهر و لذتی نمی‌برم. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .١٩٨)*

**دەڵێی لە ژەهراویێ لەوەڕاوە:** [واتە زۆر لەڕ و لاوازە]. **ف** بسیار لاغر و کم‌گوشت است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٢٠٢)*

**دەڵێی لە ڕەشی بەربووە:** [بە یەکێك دەڵێن کە قات و قڕی رووی تێ کردبێت و بە پەلە نان بخوات]. **ف** به کسی گفته می‌شود که غذا را مثل قحطی‌زدگان با هول و شتاب می‌خورد. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٢٠٢)*

**دەڵێی لە سەر بانی جەهەنەم لە وەڕاوە:** بە یەکێکی لاوازی چرووساو دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١ .٢٤٣)* **ف** [به شخص لاغر و رنج دیده گفته می‌شود.]

**دەڵێی لە سەر دنیا نیم (بە سەر دنیاوە نیم):** واتە هۆش و گۆشم نەماوە، ئومێدی هیچم نییە. *(جلال محمود بەرگی٢ . ٧٩)* **ف** [عقل و شعور و فهمم نمانده، آرزوی هیچی را نداریم.]

**دەڵێی لە سەرچاوەی سنە ڕاهاتووە:** [خۆشیان

ئەوێ و ڕێزی لێ دەگرن، بێژەر ئەم قسەیە لە ڕووی قینـەوە ئـەڵێی]. **ف** او را عزیـز و گرامی می‌دارند، گوینده‌ی این سخن از ایـن موضوع ناراحت است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ ٢٠٢)*

**دەڵێی لـە سەهەندی هەستاوە:** زۆر قەڵـەو و بەدەماخە. دەڵێی لە سەهەند لەوەڕاوە. خۆش خۆراکە. [لە بەرابەری سـەهەندەوە ڕاوێستاوە و لەگەڵیا بەربەرەکانێ دەکا وەکـوو سـەهەند جوان و گەوردیە بۆ مرۆڤـ ئـەڵێن. سـەهەند= ناوی کێوێکە لـە ئازەربایجانـا]. *(فتاحی قاضی بەرگی٢ ١٣١)* **ف** بسـیار چـاق و چلـە و خـوش خـوراک اسـت. در برابـر سـهند ایستاده و با آن رقابت می کنـد مثـل سـهند زیبا و باعظمـت اسـت بـرای انسـان گفتـه می‌شود.

**دەڵێی لە شاخی داوە:** خۆی زۆر ماندوو پیشان دەدا و زۆر برسـی دەنوێنێـت. *(جـلال محمـود بەرگی٢. ٧٩)* **ف** [خـود را بسـیار خسـته و گرسنه نشان می‌دهد.]

**دەڵێی لە چۆڵی شامێ بـەجێ ماوە:** [هەسـتی نـامۆیی و تـەنیایی دەکـات]. **ف** احسـاس غریبـی و بـی کسـی مـی کنـد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ ٢٠٢)*

**دەڵێی لە گۆیژەی داوە:** خـۆی مانـدوو پیشـان دەدات. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٩)* **ف** [خـود را خسته نشان می‌دهد.]

**دەڵێی لـە گـەرووی مـار دەرهـاتووە:** واتـە زۆر ڕاستە، زۆر پـاك و بـێ‌گـرێ و گۆڵەیـە. *(جلال محمـود بـەرگی١. ٢٤٣)* **ف** [بـــە شخصـــی درستکار و پاک گویند.]

**دەڵێی لە گیـانی خـۆی نـەبڕێ:** [نایـەوێ تـای تـەرازوو و نـەختێ بـە قـازانجی کڕیـار قـورس بێت]. **ف** کفه‌ی ترازو را نمی‌خواهـد کمـی به نفع مشتری سنگینی کنـد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ ٢٠٢)*

**دەڵێـی لـە قـەبر هاتۆتـە دەرێ:** زۆر لاواز و زەرد و قوپاوە. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٩)* **ف** [بسیار لاغر و ضعیف و تکیده است.]

**دەڵێی لە قرم هاتۆتەوە:** بە یەکێك دەڵێن کە هەڵپەی خواردن بکات و خـۆی وا پیشـان بـدا کە زۆر شەکەت و برسییە. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٩)* **ف** [بـە کسـی گوینـد کـه عجلـه‌ی خوردن داشته باشد و خود را طوری نشـان دهـد کـه انگـار بسـیار خسـته و گرسـنه است.]

**دەڵێی لە کۆچی قەرەچی جێماوە:** واتـە پـیس و پۆخڵ و چڵکنە. *(جلال محمود بەرگی٢. ٧٩)* **ف** [چرکین و کثیف است.]

**دەڵێـی لـە کەلەبـەردا گـیراوە:** شـپرزە و

شەرمەزار و بێنقەیە، وەك دز کەلەبەرێکی لە دیوارە کلّەکانـدا دەکـرد و لـەوێوە دەچـوو ماڵەکـەوە و دزیـی دەکـرد. لـەو کاتـەدا کەلەبەرەکەدا بوو دەیانگرت. برستی دەبڕا، شپرزە و تەرێق، دەپەشۆکا. واتە ئەویش وەك ئەو دزە دەنوێنێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۷۹)* ف [پریشان و شرمسـار و بـی‌صـداماننـد دزدی است که در دیـوار خانـه شـکافی را ایجاد می‌کرد تا از آن به داخل خانـه نفـوذ کند و به دزدی بپردازد. به هنگام عبـور از شکاف او را دستگیر می‌کردند و توانش را از دسـت مـی‌داد. پریشـان و آشـفته و شرمسار بـه نظـر مـی‌رسـید. یعنـی: او هـم مانند آن دزد خود را می‌نمایاند.]

**دەڵێی لە کزیوەوە هاتووە:** کزێوە= شـوێنێکی چۆڵەوانی وشك. واتە وەك لە شوێنێکی چۆڵی وشـکەوە هاتبێـت، شـپرزەی خـواردن و خواردنەوبێت برسـی و تینـووی بێـت. ئاوایـە. *(جـلال محمـود بـەرگی ۲. ۷۹)* ف [کزیـوە= جایی خالی از سکنه و بی‌آب. مانند این‌کـه از جایی خالی از سکنه و خشـک و بـی‌آب آمـده باشـد. پریشـان خـوردن و آشـامیدن باشد و این‌طور به نظر برسد.]

**دەڵێی لە کورتەکی داوە:** [واتە: خـۆی مانـدوو و شەکەت پیشان ئەدات]. ف خود را خسته نشان می‌دهد. *(فتاحی قاضي بەرگی۱. ۲۰۳)*

**دەڵێـی لـە کونـە تفنگـی (لـووتی شـەیتان) شەیتان دەرپەڕیوە:** [زۆر زیرەك و وشـیارە]. ف بسیار زیـرک و بـاهوش اسـت. *(فتاحی قاضي بەرگی۱. ۲۰۳)*

**دەڵێی لە لاوە پێوەند دراوە:** [لە خزمانە بەڵام دووری ئەکا و خۆی نەناس پیشـان ئـەدات]. ف از نزدیکان است ولی دوری و بیگـانگی از خود نشان می‌دهـد. *(فتاحی قاضي بەرگی۲ .۱۳۲)*

**دەڵێـی لـە مـووی بـەری دەنـەون:** بـە یـەکێك دەڵـێن کـە بـە دەنگـی بـەرز قسـە بکـات. بشـبرێنێ و تـوورە بووبـێ و لـە شـتێکی ناپێویست هاوار بکات. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۸۰)* ف [به کسی گفته می‌شود که با صدای بلند فریاد بزند و نابجا عصبانی شود.]

**دەڵێی لە هـەڵاڵت داوە:** [مووەکـانی ئـەوەرێ. هـەڵاڵ بـەری داری بـەڕووە بـۆ خـۆش کـردن و رووت کردنـی مەشـکە بـەکار دێـت]. ف موهایش می‌ریـزد. *(فتاحی قاضي بەرگی۱ .۲۰٤)*

**دەڵێـی لەسـەر ئاورانـە (ئاگرانـە):** [سـتاری نییە و بۆ رۆیشتن بەپەلەیە]. ف بی‌قرار است و برای رفتن عجلـه مـی‌کنـد. *(فتاحی قاضي بەرگی۱ .۲۰۲)*

**دەڵێی لەسەر درکە (بەسەر درکەوەیە):** بەسەر

درکەزبیبەوەیـە: واتـە ئـۆقرەی لەبـەر بـڕاوە و پەلـەی ڕۆیشـتنیەتی. *(جلال محمود بەرگی ۲ . ۷۹)* **ف** [آرام و قرار ندارد و عجلەی رفتن را دارد.]

**دەڵێی لەسەر سووتوان راهـاتووە:** [زۆر لەبـەر چاوی باوك و دایکـی خۆشەویسـتە ئـەڵێی لـە دوای منداڵانێ کە مردوون بە دنیا هـاتووە]. **ف** بسیار در نظر پدر و مادرش عزیز است گویی بعد از فرزندانی کە مردەاند بـە دنیـا آمدە است. *(فتاحی قاضی بەرگی۱ .۲۰۳)*

**دەڵێی لەسەر گای ران‌شکاوەوە هـاتووە:** واتـە (زۆر برسییە) وەك یـەکێك ماوەیـەکی زۆر بـە لای گـای ران شـکاوەوە مابێتـەوە و برسـی بووبێت. شپرزەی خواردن بێت. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۷۹)* **ف** [بسـیار گرسـنە اسـت و مانند کسی است کە مدت زیادی نگهبان و محـافظ گـاو پاشکسـتەای بـودە و بـرای خوردن پریشان‌حال باشد.]

**دەڵێـی لەسـەرگـە نجی قـاروون دانیشـتووی:** [لـەخۆڕایی پـارە خـەرج دەکـەی و تێبـینی دواڕۆژ ناکـەی]. **ف** بـی‌دریـغ پـول خـرج می‌کنـی، و بـە آینـدە نمـی‌اندیشـی. *(فتاحی قاضي بەرگی۱ .۲۰۳)*

**دەڵێی لەسەر هەتیوان دانیشتووە:** [واتـە: لـە رادەبەدەر خەرج دەکـا و وێـڵ‌خەرجـە]. **ف** در خرج کردن و صرف مال زیادەروی می‌کند. *(فتاحی قاضي بەرگی۱ .۲۰۳)*

**دەڵێی لەغاوی شەیتانی لە دەمدایە:** چـرووکە و دەمی ناچێتە مـاڵی خـۆی، بـۆی نـاخۆرێ. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [خسیس است و مال خویش را نمی‌خورد و بـرایش هضـم نمی‌شود.]

**دەڵێی لەو ئاوس بووە:** بە یـەکێك دەڵـێن کـە بـە ناهـەق رقـی لـە یـەکێکی‌تـر بێـت. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [بـە کسـی گفتـە می‌شود کە بی‌جهت و بدون دلیـل از کسـی کینە بە دل داشتە باشد.]

**دەڵێـی مۆتەکەیـە (شـەوە):** مۆتەکـە ژنێکـی ئەفسانەییە حـەز لـە کـوڕی بـاڵق دەکـات لـە خەوتندا بـە خۆیـەوە دەیگوشـێت لەبـەر ئـەوە ئـەو کـوڕە دەمـاری سسـت دەبێـت و دەنگـی دەگیرێـت، تـا دەسـت بـۆ بەنـدە خوێنەکـەی نەبات یان خەبەری نەبێتەوە مۆتەکە کـە لێـی نابێتـەوە، ئـەو سـامۆتەکە لـە ترسـا بـەری دەدات. ئەمە بە یەکێکی قەبەی قورس دەڵێن کە بچێتە کۆڵی یەکێك. *(جلال محمود بەرگی۱ . ۲٤٦)* **ف** [کابوس زنی افسانەای اسـت کـە عاشق پسر بالغ اسـت و در خـواب او را در آغوش خویش می‌فشـارد و همـین موجـب سسـت شـدن رگ‌هـای آن پسـر شـدە و

صدایش نیز گرفته می‌شود. تا آن پسر دست به بند کمرش نبرد یا به علتی از خواب بیدار نشود کابوس از او دور نمی-شود.]

**دەڵێی مۆرانەیە (موریانە):** ١) بە یەکێك دەڵێن کە ڕووی کردە شتێك کارێك، تا تەواوی نەکات واز نەهێنێت و بچێتە بنج و بناوانی ئەو شتە، ئەو کارە ٢) یەکێك بەداخەوە بە یەکێکیتر دەڵێت: بووی بە مۆرانەبۆم. واتە: دات رزاندم پەکت خستم، هێندە ناسۆر و دەردت دامێ. هێندە زیانت پێ گەیاندم. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٧)* **ف** [١) به کسی گفته می‌شود که وقتی آماده و دست بکار چیزی یا کاری شد تا آن را به اتمام نرساند دست بردار نباشد. ٢) کسی به کس دیگر گوید برای من شبیه به مورچه شده‌ای به واسطه رنج و آزار زیادی که به من رسانده و مرا از کار انداخته و پوسانده‌ای.]

**دەڵێی ماران مژتوویانە:** لەڕ و لاواز و بێ‌گۆشتە. *(جلال محمود بەرگی٢. ٨٠)* **ف** [لاغر است و همه‌اش استخوان است.]

**دەڵێی مارە:** بە یەکێك دەڵێن کە بێ خشپەو دەنگ بڕوات بەڕێوە. یان کەسێك بە کردەوە یان قسە، چزی خۆی بوەشێنێ. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٣)* **ف** [به کسی گویند که آهسته و بی‌سر و صدا راه برود. کسی که به عمل یا سخن، نیش خود را زده باشد.]

**دەڵێی ماری حەوتسەرە:** بە یەکێك دەڵێن ١) وەزندی زۆر بێت. هار و هاج بێت ٢) بە توانا بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٣)* **ف** [١) به کسی بسیار آزاردهنده و ناآرام و بازیگوش گویند. ٢) نیرومند باشد.]

**دەڵێی ماری ناو فەقیانەیە:** نە هێنبڕە، لە ناکاوا پێوە ئەدا. *(جلال محمود بەرگی٢. ٨٠)* **ف** [کینه‌توز است و ناگهان او را می‌گزد. (مار در آستین پروراندن)]

**دەڵێی ماستمان خواردووەو دۆمان بەوداوە:** بە یەکێك دەڵێن کە لە هیچ لە خۆیەوە زویر بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٣)* **ف** [به کسی گویند که خودبخود و بدون هیچ دلیلی ناراضی و غمگین باشد.]

**دەڵێی ماسی ژەهر خواردووە:** [هۆش و بیری دروستی نییە]. **ف** هوش و حواس درست و حسابی ندارد. *(فتاحی قاضي بەرگی٢. ١٣٢)*

**دەڵێی ماڵە قەرەتاژدین بەگییە:** [بە ماڵێك ئەڵێن میوان و ئاوەن و ڕەوەن و هاتوچۆکەری زۆر بێت]. **ف** به خانه‌ای گفته می‌شود که جنب و جوش و رفت و آمد مهمان در آن

زیاد باشد. *(فتاحی قاضی بەرگی۱ .۲۰٤)*

**دەڵێی مانگا بەکەڵە:** بە یەکێك دەوترێ کە خەڵکێکی زۆری بەدواوە بێ. بۆ سووکی وای پێ دەڵێن. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [بە کسی گفتە می‌شود کە مردم بسیاری بە دنبال داشتە باشد. برای رسوایی بە او می گویند.]

**دەڵێی مانگی گیراوە:** بە ئافرەتێکی جوان دەوترێ کە پەژارە دایگرتبێت و رەنگی تێكدا بێت. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [بە زنی جوان گفتە می‌شود کە غم و غصە او را فرا گرفتە باشد و پریشان باشد.]

**دەڵێی ماینی کەحلانە:** بە ژنێکی جوانی شۆخ و شەنگی باڵابەرز دەوترێ. ماینی کەحلان ماینێکی عەرەبییە. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [بە زنی زیبا و خوشکل و شیک‌پوش گفتە می‌شود.]

**دەڵێی مەرە ( پەزە ) مەڕی گێژە:** واتە بێ‌دەسەڵاتە و بێ درك و مردە لۆخەیە. *(جلال محمود بەرگی۱ . ۲٤٤)* **ف** [یعنی بی‌قدرت و بی‌خار و لاغر و کوچک اندام است.]

**دەڵێی مەڕنەمووکەیە:** بە یەکێکی لاوازی بێ‌هێز دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [بە شخصی لاغر و ناتوان گفتە می‌شود.]

**دەڵێی مەڕی ( پەزی ) پەیغەمبەرە:** بە یەکێك دەڵێن زۆر بەستەزمان بێت و ئازاری بۆ هیچ کەس نەبێت. *(جلال محمود بەرگی۱ . ۲٤٤)* **ف** [بە کسی بسیار بیچارە گفتە می‌شود کە برای هیچ کسی اذیت و آزاری نداشتە باشد.]

**دەڵێی مەڕی پێ ( پا ) بەستراوە:** پەلی شل و شەکەت بووە، هێزی ڕۆیشتن و جووڵانەوەی نەماوە. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۸۰)* **ف** [دست و پایش خستە و کوفتە شدە و قدرت رفتن و حرکت کردن را ندارد.]

**دەڵێی مەزا تخانەکەیە:** بە ماڵێك، شوێنێك دەوترێ کە پەرش و بڵاو و هەروەها شوێنێکی پڕ لە هات و هاوار بێت. *(جلال محمود بەرگی ۲ . ۸۰)* **ف** [بە خانەای یا جایی بی‌نظم گفتە می‌شود کە پخش و پلا شدە باشد و هیچ چیز سر جای خودش نباشد. جای شلوغ و پر سر و صدا را نیز گویند.]

**دەڵێی مەشکە تاڵ دەدات:** جەوتی تێ هەڵدەسوون تا خۆشی بکات بۆنی مەشکەکە ببڕێت، دۆکەی خۆش بێت. ئەمە بە یەکێك دەڵێن چای زۆر بخواتەوە و چاکەش خەست بێت. *(جلال محمود بەرگی۱ . ۲٤٤)* **ف** [مشک را در مایعی از بلوط فرو می‌برند و بە آن می‌مالند تا قابل استفادە و ضدعفونی شود تا اگر بوی بدی هم داشتە باشد از میان

برود و با این کار دوغ آن قابل استفاده شود و این به کسی گفته می‌شود که چای غلیظ زیاد بنوشد.]

**دەڵێی مەکۆی جۆلایە:** بە یەکێك ئەڵێن کە زۆر بێت و بچێت و ما خۆلانی پێ کەوتبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٤)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که بسیار آمد و شد کند و همین موجب مبتلا شدن او به بیماری لرزش سر شود.]

**دەڵێی مەلەوانی کوندە لە دەست بەربووە:** بە یەکێك دەڵێن لە سەری لێ‌شێوا بێت و کەوتبێتە هاتووچۆ. شپرزە بێت. *(جلال محمود بەرگی٢. ٨٠)* **ف** [به کسی پریشان و سرگردان شده گفته می‌شود که بی‌جهت رفت و آمد کند.]

**دەڵێی مەیموونە:** بە یەکێك ئەڵێن کە نابووت و ناشیرین بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٤)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که چهرەی زشت داشته باشد.]

**دەڵێی مردووی مردووە:** بە یەکێك دەڵێن کە نە یاری یەکێك بێت بە دەسکەوت و بەرزیی ئەو کەسە، تێك چووبێت. ١) پەژارە و گرژ و مۆن دایگرتبێت ٢) بە یەکێك دەڵێن کە لە خۆیەوە گرژ و مات و بێ‌نقە بێت. *(جلال محمود بەرگی٢. ٨٠)* **ف** [١) غم و غصه او را فراگرفته و افسرده شده است. ٢) به کسی گفته می‌شود که خود به خود اخمو و غمناک و بی‌صدا باشد.]

**دەڵێی مریشکە بەکڕە (مامرە وەکڕە):** بە یەکێك دەڵێن هەر لەماڵەوە خزابێت و نەچێتە دەرەوە. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٥)* **ف** [معمولاً به کسی گویند که زیاد در خانه بماند و بیرون نرود.]

**دەڵێی مریشکی ئاشەوانە (ئاسیاوانە):** بە یەکێك دەڵێن بە سەر ئەم و ئەوەوە بلەوەڕێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٥)* **ف** [به کسی گویند که سر بار دیگران باشد و از آن‌ها تغذیه کند.]

**دەڵێی مریشکی ئاوەڕووتکراوە:** بە یەکێکی رووت وڕەجاڵ دەوترێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٥)* **ف** [به کسی بسیار فقیر و تنگدست گویند.]

**دەڵێی مشتەی ناو هەمانەیە:** بە یەکێك دەڵێن کە بە نهێنی زمان و دەستی لە کاردا بێ و وەزەن بدات. ئەم وتە جێگرە لەو چیرۆکە فولکلۆرییەوە هاتووە کە باوەژنەکە مشتوویەك دەخاتە هەمانەیەکەوە و لە هەنەزاکەی ئەدات و پەکی هەنەزاکەی پێ دەخات. *(جلال محمود بەرگی١. ٢٤٥)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که مخفیانه زبان و

**ف** از حیث مقدار، فراوان و کم‌ارزش است. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٤٤٥)*

**وەك خۆمـان لـێ بێتـەوە:** [هەڵئەگەڕینـەوە سەرەتا و هەل و دەرفەتی پێش هـاتوو لەبەر چاو ناگرین]. **ف** به حال نخست برگردیم و وضـعیت پـیش آمـده را نادیـده بگیـریم. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٤٤٥)*

**وەك خۆیشك و برا:** [خۆشەویست و دڵسۆزی یەك] **ف** مهربان و دلسوز هم. *(حیرت. ٥٤٠)*

**وەك خـاك داكریـاگ (داكـراو):** [بـە مرۆڤـی ئارام و لەسەرخۆ و بێفیز ئـەڵێن] **ف** ١) بـه شخصی آرام و متواضع گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك خـەرامانی چـینە:** واتـە زۆر جوانـە. خـەرامان ئـافرەتێكی ئەفسـانەییە، نموونـەی جـوانیی و شـۆخییە. *(جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥٠)* **ف** [بسـیار زیباسـت. خرامـان زنـی افسانه‌ای، الگوی زیبایی و طنازی است.]

**وەك خەرتـەل (داڵاش) وایـە:** بـۆن دەكـا. بـە یـەكێكی لاشخـۆر و چـڵێس دەوتـرێ. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٥)* **ف** [بـو مـی کشـد. بـه کسی طمعکار یا لاشخور گفته می‌شود.]

**وەك خە نجـەر:** [١) وڵامـی تونـد ٢) وتـاری رەوان و بێگرێ و گۆڵ ٣) برژانگی زۆر و تیژ] **ف** ١) جـوابی سـخت ٢) گفتـاری نافـذ ٣) مژگانی بلند و تیز. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك خە نجەری دەبان لە كێلانا ناوەستێ:** بـە یەكێك ئەوترێ كە جەوهـەرێكی بـبێ و دەری بخـات. *(خاڵ.پ.٤٧٢)* **ف** [بـه کسـی گفتـه می‌شود که هنری داشته باشـد و آشـکارش بکند.]

**وەك خە نجەری شویری لـێ هاتووە:** خوێنڕێژ و بێبەزەیی و دەمارگرتووە. *(جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥١)* **ف** [ظـالم و سـنگدل و متکبـر است.]

**وەك خەو تێتە بـیرم:** [زۆر كـز و لاواز شـتێك بێتەوە بیر یان لە زەنیا مابێ] **ف** چیزی کـه مانند رؤیا در ذهن مانده باشد. *(حیرت. ٥٤٠)*

**وەك خـەون لـە بـیرم دێ:** [زۆر كـەم دێتـەوە بـیرم]. **ف** خیلـی مختصـر آن را بـه یـاد می‌آورم. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٤٤٥)*

**وەك خەونە:** واتـە ئـەوەی كـە دەیبیـنم جێـی بڕوام نییە. لە ئەندێشەی مندا نەبووە و نییە. *(جلال محمود بەرگی١ .١٤٤)* **ف** [چیزی را که می‌بینم به آن اطمینان ندارم و در اندیشـه‌ی من نمی‌گنجد و در پذیرفتن آن شک دارم.]

**وەك خەیاتە:** [١) بە ڕێسراوی باریـك ئـەڵێن ٢) لێوی ناسك] **ف** ١) رشـته‌ای باریـک ٢) لبی نازک را گویند. *(حیرت. ٥٤٠)*

**وەك خەیار:** [بە یەکێك ئەڵێن کە ئەنگوستی درێژ و قەڵەوی ببێت.] **ف** به کسی گویند که انگشتانی دراز و پرگوشت دارد. *(حیرت. ٥٤١)*

**وەك خرس:** [بە یەکێکی قەڵەو و فرەخۆر ئەڵێن] **ف** ۱) به شخصی فربه و پرخور گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك خووك:** [ ۱) بێڕەوشت و بێئاکار و تووڕە ۲) قەڵەو و فرەخۆر] **ف** ۱) بی‌ادب و خشمگین ۲) فربه و پرخور. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك دار تەرم:** [جەستەی وشك و بێ جم وجووڵ] **ف** به بدنی خشک و بی‌حرکت گویند. *(حیرت. ٥٤١)*

**وەك داسك و دەرزی لێ‌هاتووە:** زۆر لاواز بووە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۱٥۱)* **ف** [بسیار لاغر شده.]

**وەك داشە هارەم لێ هاتووە:** [بۆ بژێوی ژیان ناچار بە کار و تێکۆشان و راکردنم]. **ف** برای تأمین معاش مجبور به فعالیت و دوندگی زیادی هستم. *(فتاحی قاضی بەرگی ۱. ٤٤٥)*

**وەك دایك ئاڵ:** [بە ژنێکی ناوچاو تاڵ، زل، مووگژیاگ و بالابەرز دەڵێن] **ف** به زنی بدخوی، مهیب، ژولیده موی و قدبلند گویند. *(حیرت. ٥٤١)*

**وەك دایك وەوی:** بە یەکێك ئەڵێن کە سەری جەنجاڵە. *(رخزادی. ٤٠۱)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که سرگرم و سرشلوغ کاری باشد].

**وەك دایك:** [دڵسۆز و خۆشەویست] **ف** دلسوز و مهربان. *(حیرت. ٥٤١)*

**وەك دەروازە:** [بە یەکێکی دەمزل دەڵێن] **ف** ۱) به کسی گویند که دهانی گشاد و باز داشته باشد. *(حیرت. ٥٤٢)*

**وەك دەروازەی بازار:** بڕوانە بۆ پەندی (وەك دەروازە). *(حیرت. ٥٤٢)*

**وەك دەسەی گوڵ:** [ ۱) بە منداڵێکی پاك و خاوێن ئەڵێن ۲) بە ماڵێکی خاوێن و پاك ئەڵێن] **ف** ۱) به کودکی پاکیزه گفته می‌شود. ۲) به خانه‌ای روفته و تمیز گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٤٢)*

**وەك دەستی کەر لێی داکەوتووە:** [بێکار و کاسپییە، دەست بەتاڵە، بێدەسەڵاتە، ماندوو و پەرێشان پاڵ کەوتووە]. **ف** بیکار است و خسته و بی‌حال بر زمین دراز کشیده است. یا بر زندگی خود یا خانواده هیچ تسلطی ندارد. *(فتاحی قاضی بەرگی ۱. ٤٤٦)*

**وەك دەلوو:** [بە یەکێکی فرە وێژ و قسەفرەکەر دەڵێن] **ف** به شخصی وراج و

پرحرف است می گویند. (حیرت. ٥٥٦)

**وەك دەماوەند سەری تەمە (بە تەمە):** ١) بیر و هۆش و خەیاڵی فڕیوە هۆشی لانەماوە ٢) تەمی داخ و پەژارە مێشکی گرتووە. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥١) **ف** ١)[فکر و خیالش فرار کرده ٢) غبار غم و غصه مغز او را فراگرفته.]

**وەك دەمنە قلیسان:** [بە جەستەیێکی لاواز دەڵێن کە لە فەوتاندا بێت] **ف** بە تنی باریک و بی‌دوام گویند. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك دەنکەی هەنار:** [بە منالێکی جوان و خاوێن و شیرین دەڵێن] **ف** بچه‌ای زیبا و تمیز و شیرین را گویند. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك دەنووك کەو:** [بە شتێك ئەڵێن کە باش سوور کرابێتەوە.] **ف** ١) چیزی که خوب سرخ شده باشد. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك ددانی (دیانی) مار وایە:** [بە یەکێکی زرنگ و هۆشیار دەڵێن]. **ف** بە شخصی زیرک و باهوش گفته می‌شود. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٤٥)

**وەك درووی (دڕك) ماری وایە:** [زڕنگ و هۆشیارە، هەڵناخڵەتی]. **ف** زیرک و باهوش است، سرش کلاه نمی‌رود. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٤٦)

**وەك دڵۆپە وایە:** [بوونی مایەی ڕەنج و ئازارە لە ناکاو پەیدا دەبێ]. **ف** حضورش مایەی دردسر است. ناگهان پیدایش می‌شود و می-آید. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .٢٧٦)

**وەك دمارەکۆڵ ئەدات بە بنیامەووە:** [قین لە دڵە و بە قسەکانی ئازار دەگێنێ] **ف** کینه‌جو با گفتاری رنج‌دهنده است. (حیرت. ٥٤١)

**وەك دمارەکۆڵ دایم چزی بەرەوژوورە:** [زیانبار، قسەڕەق و ئازاردەر، ئامادەی شەڕە] **ف** شخصی موذی و آزاردهنده است. آمادەی دعوا مرافعه است. (حیرت. ٥٤١)

**وەك دوڕ:** [١) سپی و روون ٢) بە قسەیەکی جوان دەڵێن کە بە دڵەوە بنووسێ] **ف** ١) سفید و شفاف ٢) به سخنی نغز و دلچسب گویند. (حیرت. ٥٤١)

**وەك دووخ وایە:** ١) وەك تەشییە، هەر دەرێسێت ٢) بە دەست هەرکەسێکەوە بێت دەیخولێنێتەوە. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥١) **ف** ١)[ مانند دوک مدام می‌بافد ٢)[ با هر کسی باشد او را می‌چرخاند.]

**وەك دووزەلە:** [بە مرۆڤێکی لەڕولاواز دەڵێن کە دوو پێیان بەنەی چواندبێت.] **ف** بە شخصی ضعیف و مردنی گویند که ساق

پاهایش را به نی تشبیه کرده باشند. (حیرت. ٥٤١)

**وەك دووكەڵ:** [ ١) خێرا و توند و ڕەش ٢) بە ماڵ و سامانێك دەڵێن كە لە زووترین كاتدا و بە خۆڕایی خەرج كرابێت] **ف** ١) تند و سریع و سیاه ٢) به ثروت و مالی گویند كه زود و بی‌مورد مصرف شده باشد. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك ژێر كاسە و بان كاسەن:** بە دوو كەس ئەڵێن كە پێكەوە كەین و بەینیان هەبێ **ف**[به دو نفر گفته می‌شود كه با هم و سر و سری دارند از راز هم خبر دارند].

**وەك ژێی ڕێك هات (ژێی كەوان هاتەوە یەك):** [بە بیستنی هەواڵێك یان قسەیەك تێكچوو و گرژ و پەست بوو، هەڵقرچا]. **ف** از شنیدن مطلبی ناراحت و منقبض شد. (فتاحی قاضی بەرگی١ .٤٤٦)

**وەك ڕۆنی سە (سەگ) دە (لە) قالبی دەی وایە:** بۆ سووكیی یان بەرقەوە بە یەكێك دەڵێن كە بە شتێك، بارێك، قسەیەك، ڕووداوێك خۆشحاڵ بێت یان خۆی وا بنوێنێت. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥١) **ف** [از روی رسوایی یا كینه به كسی گفته می‌شود كه به چیزی، باری، سخنی، رویدادی خوشحال باشد یا این‌طور نشان دهد.]

**وەك ڕێخ:** [بە شتێكی زۆر و بێ‌بایخ دەڵێن] **ف** ١) چیزی فراوان و بی‌ارزش را گویند. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك ڕیش بزن:** [بە ڕیشی كورتی سەر چەناكە و نووكتیژ ئەڵێن.] **ف** به ریشی كوتاه گویند. (حیرت. ٥٤٢)

**وەك ڕێوی:** [فێڵباز] **ف** گربز و حیله گیر. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك زاڵو (زاروو):** [(زاروو)، بە یەكێكی حەرام خۆر دەڵێن كە ماڵ و سامانی خەڵك بۆ لای خۆی دەكێشێ] **ف** ١) به نزول خور و سودجویی می‌گویند كه مال مردم را می‌خورد. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك زاوا:** [بە لاوێكی بەژن و بالاجوان و ڕازاوە ئەڵێن] **ف** ١) به جوانی آراسته و زیبا گویند. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك زەردەچۆ:** [بە ڕوومەت یان شتێكی زەرد ڕەنگ دەڵێن.] **ف** ١) به رخساره یا چیزی بسیار زرد گویند. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك زەنگیانە:** [بە چاوی زۆر چكۆلە ئەڵێن] **ف** به چشمی ریز و ناپیدا گویند. (حیرت. ٥٣٧)

**وەك سەبەتەی ـ بن ـ بەن پچڕاوە ـ وەك ترازووی بەن پچڕاوە:** ١) بێ‌دەسەڵاتە، هیچی بە دەست نییە ٢) لێ نەهاتووە. (جلال محمود

بەرگی١. ٤٧٦) ف [١) تسلط و قدرتی ندارد ٢) بی‌ارزش و نالایق است.]

**وەك سەگ ئەلاڵیاوا :** [بۆ سووکیە، بە یەکێك ئەڵێن کە دەست بە دامان بێت و لە بەرانبەری یەکێکی‌تردا بپاڕێتەوە] ف برای تحقیر است کسی کە در مقابل دیگری بە زانو درآید. طلب بخشش یا کمک نماید. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك سەگ بە مانگەشەو بوەڕێ وایە :** بە یەکێك ئەوترێ کە ناوی پیاوێکی گەورە بە خراپ ببا. (خاڵ.پ.٤٧٣) ف [بە کسی گفتە می‌شود کە از بزرگان بە بدی یاد بکند.]

**وەك سەگ پا ئەوا بە دەما :** [١) بە هەموو کەسێ جنێو ئەدا و خراپە ئەڵێ ٢) بە پیاو یا ژنێکی بێباك و بێ شەرم ئەڵێن] ف ١) بە همە دشنام می‌دهد ٢) مرد یا زنی دریدە و جسور را گویند. (حیرت. ٥٤٣)

**وەك سەگ پاسووتیاگ:** [بە یەکێك ئەڵێن کە بێسەر و بەر بۆ هەموو لایەك ئەڕوات.] ف کسی را گویند کە بە هرجانب دوان است. (حیرت. ٥٤٤)

**وەك سەگ دەپاڕێتەوە:** بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە دەستەو دامان بێت. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥١) ف [برای رسوایی بە کسی می‌گویند کە بە دیگران پناە ببرد و التماس کند.]

**وەك سەگ سەمەنۆکی دەکا :** سەمەنۆك= پەت، تورکییە. واتە دەیگرن و پەتی دەکەن بۆ سووکی وا بەو کەسە دەوترێت. (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٥) ف [سەمەنۆك: رسن، ترکی است. یعنی او را می‌گیرند و ریسمان بە گردنش می‌اندازند، و مهارش می‌کنند. برای رسوایی بە چنین شخصی گفتە می‌شود. یا او را بە بند کشیدە باشند.]

**وەك سەگ سپڵۆت :** [بە کەسێك یان شتێکی پیس و ناپاك ئەڵێن ٢) بە مرۆڤی چەپەڵ و ناپاك ئەڵێن.] ف ١)بە کسی یا چیزی نجس گویند ٢) بە شخصی پلید و ناپاک گویند. (حیرت. ٥٤٤)

**وەك سەگ قەساوخانە :** [١) حەپەکەر و گەڕاڵە ٢) نەترس و بەدفەڕە ٣) بێحەیا و دەمپیسە.] ف ١) پارس کنندە و هرزە‌گر و بی‌هدف ٢) نترس ٣) بی‌شرم و جنگ‌افروز و بددهان. (حیرت. ٥٤٤)

**وەك سەگ هاری پێهاتگە (هاتووە):** [١) بە یەکێك ئەڵێن کە کاری ئازار گەیاندن و جنیوفرۆشتن بە خەڵکە ٢) رەنخینەرو چەوسینەر] ف ١) بە کسی کە هموارە آزاردهندە و دشنام گویندە است ٢) کسی

مـوذی اسـت و در بـدی کـردن دوسـت و دشمن بـرایش فرقـی نـدارد و بـرایش مهـم نیسـت. *(حیرت. ٥٤٤)*

**وەك سەگ:** [ (١) بێباك ٢) تووڕە ٣) ترسیاگ ٤) ناپاك و پیس ٥) پەشیمان ٦) بەئەمـەگ] **ف** ١) جسـور ٢) خشـمگین ٣) ترسـان ۴) ناپاک ۵) پشیمان ۶) باوفا. *(حیرت. ٥٤٣)*

**وەك سـەگی بـەیانان نووسـتوو وایـە:** [ئـەڵێن بەیانیان رسق و ڕۆزی لە نێوان مرۆڤـدا دابەش دەکەن، لە ئەو کاتەدا سەگ نووستووە و بـەم بۆنەوە بێبەش دەبێ]. **ف** گویند سحرگاهان روزی در میان خلایق تقسیم میشود سـگ در آن هنگام به خواب میرود، بنـابراین از روزی بـینصـیب مـیمانـد. *(فتـاحی قاضـي بەرگی٢ .٢٧٦)*

**وەك سـەگی پـێ سـووتـاو وایـە:** بـە یـەکێك ئـەوترێ کـە زۆر خـوێڕی و گـەڕۆك بـێ. *(خاڵ.پ.٤٧٣)* **ف** [به شخصی بیکار و بسیار گردنده می گویند.]

**وەك سـەگی هـار لاقـی خـەڵکی دەگـرێ:** [لـە خۆیەوە ئەچێت بـە گژ خەڵکدا]. **ف** بـدون هیچ دلیلـی بـا دیگـران درگیـر و گلاویـز میشود. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .٢٧٦)*

**وەك سەگی هەڵەوەڕ دز دێنێتە سەر ساحێبی:** [بە وەڕین ناوەخت خاوەنەکـەی گـیرۆدەی دزان دەکـات]. **ف** بـا عوعـوی بـیموقـع خـود، صاحبش را گرفتار دزدان مـی کنـد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٤٧)*

**وەك سەکۆی پینەچی:** [بە یـەکێك ئـەڵێن کـە ستیکی پان و پـۆڕ و قەڵـەوی ببێـت] **ف** بـه کفلی پهن و چاق گویند. *(حیرت. ٥٤٣)*

**وەك سەنگ (کوچك) بێدەنگ:** [بە نەخۆشـێك ئەڵێن کە ئـارام و بێحـاڵ بێـدەنگ بێـت] **ف** مریضی ساکت و بیحال را گویند. *(حیرت. ٥٤٤)*

**وەك سـك پـڕ (دووگیـان):** [ڕێگەوچـوونێکی تایبەتی ژنێکی دوگیانە کـە لەبـەر سـکەکەی قورسە و بە باشی ناتوانێ بڕوات بە ڕێگـادا.] **ف** راه رفـتن مخصـوص زنـان بـاردار را گویند. *(حیرت. ٥٣٧)*

**وەك سنجوو وایە؛ سەری سوورە و نێـوی ڕەشـە:** [بە شتێك یا کەسێك دەڵێن کە ڕواڵەتی بـاش بێ بەڵام لـە دەروونـەوە خـراپ بێـت]. **ف** بـه چیزی یا کسی گویند کـه ظـاهرش خـوب ولی باطنش بـد باشـد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٦)*

**وەك سواڵکەری مەکە و مەدینەیە:** کەسێکە بۆ کردنی کارێـك دەسـتەو دامـانێکی زۆر بێـت، تکا بەرێتە بەر ئەم و ئەو بۆ جێبەجێ کردنـی

کارەکـەی. *(جلال محمود بەرگی ئـ۲. ۱۵۱)* **ف** [کسی است که برای انجام دادن کارش بـه دیگران پناه ببرد و از آن‌ها التماس کند که کارش را انجام دهند.]

**وەك سـوخاڵ (خـەڵووز):** [ (۱) رووی رەش ۲) هەوری لێڵ ۳) دڵی تاریك و پڕ لـه قـین] **ف** ۱) چهـره‌ای سـیاه ۲) ابـری تیـره ۳) قلبـی تاریک و پر کینه. *(حیرت. ۵٤۳)*

**وەك سووتـاویی هەر پێوەی دەچێت:** بۆ کارێکە هەر تەواو نەبێت، حەز بە تەواو بوونی بکرێت بەڵام بە پێچەوانەی مەیل و ئارەزووەوە لەباتی کۆتـایی هـەر درێـژە بکێشێت. *(جلال محمود بەرگی ئـ۲. ۱۵۱)* **ف** [برای کـاری اسـت کـه هرگز تمام نشود و تلاش برای تمام شدنش انجام گیرد امـا بـرعکس تمـام شـدنش بـه درازا بکشد.]

**وەك سـێفەزەوینی:** [بـە یـەکێکی خـوێڕی و بێدەمـار دەڵـێن] **ف** بـه کسـی بـی‌رگ و بی‌غیرت و بی‌تعصب گویند. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك سێفەسـوورە:** [بە یەکێك ئەڵێن کە گۆنا یا روومـەتی شـاد و سووری ببێـت.] **ف** بـه کسی گویند که گونه و رخساره‌ی گلگـون داشته باشد. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك سـێوەر (سـێبەر):** [بـە شـوێن و دوای کەسێکەوە بوون] **ف** به دنبال و عقب کسـی بودن. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك شارەمرۆچە:** [قەرەباڵخ و هەرا و هوریای زۆر] **ف** ازدحامی کثیر. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك شـەکەر (شـەکر):** [ (۱) بـە شـتێکی زۆر شیرین دەڵێن ۲) بە قسـە یـا وتـاری شـیرین و جوان دەڵێن] **ف** ۱) به چیزی بسیار شـیرین گفته می‌شود ۲) به گفتاری شکرین گویند. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك شـەکەر ئەتاوێتـەو:** [ (۱) بـە یـەکێکی خـۆش قسـە دەڵـێن کـە قسـەکانی بنیشـێتە دڵەوە. ] [ (۲) بـە یـەکێکی دەم بـە پێکـەنین و شاد دەڵێن] [ (۳) میوەی شـیرین و...] **ف** ۱) بـه کسـی خـوش‌گفتـار گوینـد کـه حرف‌هایش تأثیرگذار باشد۲) بـه انسـانی خنـده‌رو گوینـد ۳) بـه میـوه‌ی شـیرین و... گویند. *(حیرت. ۵٤۵)*

**وەك شەکر لە دەما دەتوێتەوە:** زۆر بە ناسـکی و رێـزەوە بـە زمـانی شـیرین دەدوێـت. *(جلال محمود بەرگی ئـ۲. ۱۵۱)* **ف** [بسیار با نرمـی و احترام، به زبـانی ملایـم و شـیرین حـرف می‌زند.]

**وەك شـەکرۆکە پێشی کـەوت و رۆیشـتەوە:** بـە یـەکێك، بەتایبـەتی بـە ئافرەتێـك دەڵـێن کـە تۆرابێت و بیبەنەوە بۆ مـاڵی مێردەکـەی یان

لەگەڵ مێردەکەیدا بە خۆشی بڕواتەوە *(جلال محمود بەرگی۲. ١٥٥)* **ف** [مخصوصاً بە زنی کە قهر کرده باشد گویند کە دوبارە او را بە خانە شوهرش برگردانند یا با خوشحالی با شوهرش برگردد.]

**وەك شەلاخ (قامچی):** [بە هەوایەکی سارد و لەشتەزێن دەڵێن] **ف** بە هوای سرد و گزنده گویند. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شەم شای بایی:** [باسکی لەڕ و لاواز] **ف** بازوی ضعیف و باریک. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شەمشەمەکوێرە:** [١) بە یەکێك ئەڵێن کە بە رۆژیش و بە زۆریش لە ماڵ نەیێتە دەرەوە] **ف** بە کسی گویند کە با زور و اجبار هم از خانه بیرون نیاید. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شەوە پیاو دەگووشێت:** بە یەکێك دەڵێن کە منداڵێك بۆ خۆشەویستی بە خۆیەوە بگوشێت یان بە هوایەك دەڵێن کە زۆر سارد بێت و لەشی پیاو گرژ بکا. *(جلال محمود بەرگی۲. ١٥١)* **ف** [بە کسی کە بچەای را از روی محبت بە سینەاش بچسباند یا بە هوای بسیار سرد کە انسان را افسرده کند.]

**وەك شەوە:** [١) ڕەش و قیراوی ٢) شتێك یان مرۆڤی نادیاری ٣) گیانلەبەرێکی ترسێنەر] **ف** ١) سیاه و قیرگون ٢) چیزی یا شخصی نامشخص ٣) موجودی ترسناک. *(حیرت. ٥٤٦)*

**وەك شەوەزەنگ:** [١) بە شتێك یا رواڵەتێکی زۆر ڕەش دەڵێن. ٢) باروودۆخێکی ترسناك و ناخۆش کە بە سەرکۆمەڵدزاڵ بێت.] **ف** ١) بە چیزی یا رویی سیاه گویند. ٢) اوضاع ترسناک و خفقان جامعه را گویند. *(حیرت. ٥٤٦)*

**وەك شمر:** [بە یەکێکی بێبەزەیی و دڵڕەق ئەڵێن] **ف** بە شخصی بیرحم و سنگدل گویند. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شمشاڵ چووگەسەسەر:** [بە لاوێکی دلێر و باڵابەرز دەڵێن.] **ف** بە جوانی رشید و بلندقامت گویند. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شمشێر:** [١) تیژ و دابڕ ٢) ئاوی سارد و کەللەتەزێن] **ف** ١) برنده و قاطع ٢) آبی سرد و گزنده. *(حیرت. ٥٤٥)*

**وەك شووتی (هەنی) لە بان کەر بەربێتەوە، وایە:** [سەرنج نەدان کەسی سبارت بە کەسێکی تر کە بە لایدا تێدەپەڕی و ریزی بۆ دانەنی.] **ف** بیتوجهی کردن شخصی نسبت بە کسی کە بر او وارد میشود. *(حیرت. ٥٤٦)*

**وەك شیر ـ شمشیر پیاو دەبڕێت:** بە سەرمایەك

دەڵێن کە پیاو بتەزێنێ و شپرزەی بکات. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥٢) ف [بە هوای سرد می‌گویند کە انسان را بی‌حس و پریشان کند.]

**وەك شیر دایك:** [١) بە شتێکی شیاو و ڕەوا دەڵێن ٢) ماڵی حەلاڵ و سازگار و خاوێن] ف ١) بە چیزی روا گویند. ٢) بە مال حلال و گوارا و پاک گویند. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك شیر هەڵدەچێ و زوو خاو دەبێتەوە:** [قین لەبەر نییە و هیچ لە دڵیا نامێنێ، زوو هێمن و ئارام دەبێتەوە]. ف کینەای در دل ندارد و زود آرام خواهد شد. (فتاحی قاضي بەرگی٢ ٢٧٧.

**وەك شیری بەری دایکت پێت حەلاڵ بێت:** بە یەکێك وا دەڵێت کە شتێکی بداتی پێی ببەخشێت. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥٢) ف [بە کسی کە چیزی را بە او ببخشند گویند.]

**وەك شیشە:** [١) بە شتێکی ناسك دەڵێن کە زوو دەشکێ ٢) بە چاوی بریسکەدار و پڕ تیشك دەڵێن] ف ١) بە چیزی متبلور و شکننده گویند. ٢) بە چشمی براق و درخشنده گویند. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك چۆنەر سوورەوەبوو:** [بە برینێك ئەڵێن کە پێستی داماڵراو بێ] ف زخمی کە پوستش کنار رفته باشد. (حیرت. ٥٣٨)

**وەك چـۆنەر:** [گوشتی سفت و سوور] ف گوشتی سرخ و سفت. (حیرت. ٥٣٨)

**وەك چالەکە وایە، تا لێی‌دەی قەڵەو ئەبێ:** دەعبایەکی پانکەڵەی چوارپێی قەڵەوە. بێ-شەرم و بێ‌عارە. (خاڵ.پ.٤٧٢) ف [بە موجودی چهارپای پهن گرد و کوچک و چاق گویند یا انسان بی‌عاری کە کتک در او بی‌تأثیر باشد.]

**وەك چاو قرژانگ:** [بە ئاوێکی ساف و زوڵاڵ دەڵێن] ف بە آبی صاف و گوارا گویند. (حیرت. ٥٣٧)

**وەك چەرچییە شەلەکەی بە دەرکی هەموو ماڵانە:** بە یەکێك دەوترێ کە سەر بە هەموو ماڵێکا بکات. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥٠) ف [بە کسی گفتە می‌شود کە بە هر خانەای سربزند.]

**وەك چەرم:** [١) بە گۆشتی نەکوڵاو ئەڵێن ٢) بە قوماش یا کوتاڵی قایم ئەڵێن.] ف ١) گوشتی نپختە و خام ٢) پارچەای محکم و ستبر. (حیرت. ٥٣٨)

**وەك چەقۆ:** [تێژ] ف تیز و برندە. (حیرت. ٥٣٨)

**وەك چەقەی بەڕەکۆن پێوە نووساوە:** [دەست

هەڵگیر نییە]. **ف** ول کن معامله نیست. *(فتاحی قاضی بەرگی ١. ٤٤٤)*

**وەك چرا ئەگرێ:** [ ١) وەك چرای پڕ تیشك ٢) روومەتی جوان و سەرنجڕاکیش ٣) هێشووی هەنگووری کە ئەدرەوشێتەوە ٤) قوماشی خۆش رەنگ و سەرنجڕاکێش] **ف** ١) چون چراغی پرشعله ٢) صورتی زیبا و دلفریب ٣) خوشەی انگوری درخشان ۴) پارچەای خوش نقش و براق و جالب. *(حیرت. ٥٣٧)*

**وەك چرا شەوقی بۆ ژێری خۆی نییە:** بە یەکێك ئەوترێ کە قازانجی هەر بۆ بێگانە بێ نەك بۆ کەس و کاری خۆی. *(خاڵ.پ.٢. ٤٧٢)* **ف**[به کسی گفته می‌شود که منافعش به بیگانگان می‌رسد تا به اقوام و نزدیکانش.]

**وەك چرا:** [بە شتێکی روون و پڕ تیشك ئەڵێن] **ف** به چیزی روشن و تابناك گویند. *(حیرت. ٥٣٧)*

**وەك چرای دز:** [کز و کەمنوور] **ف** کم‌نور و بی‌فروغ. *(حیرت. ٥٣٧)*

**وەك چزڵێك:** [بە شتێکی سوورەوە بوو ئەڵێن] **ف** به چیزی سرخ شده گویند. *(حیرت. ٥٣٨)*

**وەك چنار:** [باڵای بەرز و راست] **ف** قد بلند و کشیده. *(حیرت. ٥٣٨)*

**وەك چێشت بێ‌خوا (بێ‌خوێ):** [بە یەکێك ئەڵێن کە قسەی سارد و بێ‌تام بێت.] **ف** به گفتاری سرد و بی‌مزه گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٣٨)*

**وەك چێو:** [ ١) وشك و بێ‌جموجووڵ ٢) بە یەکێکی لەڕولاواز و ئیسقانی ئەڵێن] **ف** ١) خشك و بی‌حرکت ٢) بدنی لاغر و استخوانی. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك چێوی خومی لێ‌هاتووە:** رەنگاوڕەنگ بووە، رەنگێکی تایبەتی نییە، چێو ئەو دارەیە کە خومگەر لە دەستیدایە و رەنگەکانی پێ هەڵ ئەشلەقێنێ. واتە کەس نازانێت رووی لەکوێیە سەربەکوێیە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٠)* **ف** [رنگارنگ است رنگ مخصوصی ندارد، آن چوبی است که در دست رنگرز است و رنگ‌ها را با آن به هم می‌زند یعنی کسی نمی‌داند رو به کدام طرف است و دوستدار کدام جانب است.]

**وەك گۆمی مەنگ وایە:** بە یەکێکی هێمنی لەسەرخۆو هوشیار دەوترێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که صبور و هوشیار باشد.]

**وەك گا ئەبۆڕێنی:** [بە یەکێك ئەڵێن کە زۆر ناشیرینانە بگرێ] **ف** گریەای به صورت کریه و ناخوشایند. *(حیرت. ٥٥١)*

**وەك گـای بۆگـاوان:** [بـە لاوێکـی بێکـارە و بـەتاڵپـا ئـەوترێ] **ف** بـە جـوانی بیگـار و ولگرد گفته می‌شود. (حیرت. ۵۵۱)

**وەك گای حـاکم لـە تـەڕی دەخـوا و لـە وشکی (دەنوێ):** تەمەڵ و بێکارەیە. لەسەر و سکی ئەم و ئەم دەلەوەڕێ. (جلال محمود بەرگی ۲. ۱۵۳) **ف** [تنبل و بیکـار اسـت و از شـکم دیگران یا دسترنج دیگران می‌چرد و تغذیه می‌کند.]

**وەك گای عەلی خۆی دلێسیتەوە:** بە کەسێك دەڵێن دەست بە تاڵ یان تەمەڵ و کار نەکردە بێـت. (جلال محمود بەرگی۱ . ۴۷۷) **ف** [بـە کسی بیکار و تنبل گویند.]

**وەك گای مارۆ وایە:** بە یەکێك ئەوترێ کـە لـە هـەموو لایەکـەوە دیـار بـێ. (خاڵ.پ.۴۷٤) **ف**[بـە کسـی کـە در هرجـا مشـخص و شناخته شده باشد، گویند.]

**وەك گـای مووسـایی هـەر خـۆی دلێسـێتەوە:** مرۆڤێکـی تەمـەڵی بلـحی بێکارەیـە. (جلال محمود بەرگی۲ . ۱۵۳) **ف** [انسـانی تنبـل و ساده‌لوح و بیکاره است.]

**وەك گەڵای خەزان:** [بە بوونەی شـەڕ و ئـاژاوە و بەڵاێترەوە یان ناخۆشیکەوە زۆرێـك کـوژراو و بریندارن، یان مروڤی زەرد و لاواز.] **ف** بر اثر جنگ یا بلایی یا مرضی، عده‌ای فراوان مجروح و کشته شده‌اند. همچنین به انسانی زرد و ضعیف و پژمرده هم گوینـد. (حیرت. ۵۵۲)

**وەك گەڵای دار:** وەك پێشوو.

**وەك گەنـە نەچەسـپێ بـە ئینسـانەوە:** [بـە یەکێکی خۆڵتەکەر و زبـان چـەور دەڵـێن] **ف** بـه شخصـی متملـق و چـرب‌زبـان گفتـه می‌شود. (حیرت. ۵۵۲)

**وەك گەنمە قەنـدەهاریی هـەموو شتێکی لـێ دێ:** بـە یـەکێکی بـە جەوهـەر ئـەوترێ، کـە هەموو شتێکی لێ بێ. (خاڵ.پ.۴۷٤) **ف** [به کسی باهنر گفته می‌شود که توانـایی همـه کاری را داشته باشد یا مفید و کارا.]

**وەك گزگەکۆتەرە:** [بە پیرێك ئەڵێن کە لە نێو بنەماڵەکەیا ڕێزی لـێ نـەنێن] **ف** بـه پیـری بی‌حرمت در خانواده گفته می‌شـود. (حیرت. ۵۵۱)

**وەك گلۆڵـەموو داکـەوتووە:** بـە یـەکێکی لەپاکـەوتوو و پـەكکەوتـە و ناتـەوان ئـەڵێن. **ف**[به کسی از پا افتاده و ناتوان گویند].

**وەك گـورگ بـە دەم خشـپە وە دەچـێت:** بـە یـەکێکی بـە هەڵپـە دەوترێـت کـە لـە هـەر لایەکەوە سووسەی شتێکی کرد دوای کەوێت. (جلال محمود بەرگی۱ . ۴۷۷) **ف** [بـه کسـی طمعکار گفته می‌شود که هرگاه بو ببرد در

جایی چیزی وجود دارد سراغش را می‌گیرد و به دنبالش می‌رود.]

**وەك گورگ دەهەموو كەس ڕۆدێ:** پەلاماری هەموو كەس دەدات و ئازار بە خەڵك دەگەیەنێ. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۱۵۳)* **ف** [به همه حمله می‌کند و دیگران را می‌آزارد.]

**وەك گوریسی گاگێرەی لێ هاتووە:** بە كەسێك دەڵێن كەجڵەوی كاری لە دەست خۆیدا نەبێت. *(جلال محمود بەرگی۱. ٤٧٧)* **ف** [به کسی گفته می‌شود که آزادی عمل نداشته باشد.]

**وەك گوریسی ناو هەمانە وایە:** واتە زۆر بە پێچە (پێچ و ناڕاست). *(خاڵ.پ.٤٧٤)* **ف**[بسیار نیرنگ‌باز و مکار است.]

**وەك گوڵ ئەشكۆفێتەو:** [بە یەكێكی ڕووخۆش و بە كێف و شاد ئەڵێن] **ف** روی خندان و شادان. *(حیرت. ٥٥١)*

**وەك گوڵۆڵە بەفر، هەتا تلەوە بێ گەورەتر ئەبێ:** بە یەكێك یان كارێك ئەوترێ تا دەستی لێ بدەی خراپتر دەبێ. *(خاڵ.پ.٤٧٤)* **ف** [به کاری گفته می‌شود که هرچه دستکاریش کنید و به آن دست بزنید خرابتر و بدتر خواهد شد.]

**وەك گوڵاڵە سوورە:** [ڕوومەتی سوور و گەشاوە] **ف** رخسارەی سرخ و درخشان. *(حیرت. ٥٥١)*

**وەك گوڵە بەڕۆژە هەر دەمە روو لە لایەكە:** [هەلپەرستە و هەر دەمە لەسەر بیر و بڕوایەكە]. **ف** ابن‌الوقت است و ثبات عقیده ندارد. *(فتاحی قاضي بەرگی۱. ٤٥٢)*

**وەك گوڵە بەڕۆژە هەردەم روو لەلایەكە:** واتە لەسەر هیچ بیر و بڕوایەك تا سەر ئۆقرە ناگرێت و نامێنێتەوە، هەردەمە لەسەر باوەڕێك و سەربەلایەكە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۱۵۳)* **ف** [همیشه بر عقیده ثابتی نیست هر لحظه در جبهه‌ای و طرفدار گروهی است.]

**وەك گوڵی گەشاوەیە:** شاد و دڵخۆشە، جوان و ڕووخۆش و ڕووگەشە. *(جلال محمود بەرگی ۲. ۱۵۳)* **ف** [شاد و سرحال و زیبا و خوش‌برخورد است.]

**وەك گوڵی قوڕاوێی لێ هاتووە:** [تەواو لەشی تەڕ و پیسە]. **ف** تمام بدنش تر و خیس و کثیف شده است. *(فتاحی قاضي بەرگی۱. ٤٥٢)*

**وەك گوێز هەڵدەیتە (بیخەیتە) سەرگومەز وایە:** كارەكەی بێ ئەنجامە، چون گوێز بە گومەزەوە ناوەستێ، كارەكەی سەر ناكەوێت و سەر ناگرێت. ئامۆژگاری هەڵناگرێ. *(جلال

محمود بەرگی ٢. ١٥٣) ف [کارش بی‌نتیجه است چون گردکان بر گنبدست که قرار گرفتن گردو بر گنبد صورت‌پذیر نیست. کارش این گونه است و پیروز نمی‌شود و به انجام نمی‌رسد. چون پندپذیر نیست.]

**وەك گوێزی ئازا وایە :** لەش ساغە، گوێزی ئازا ئەوەیە کە بە ئاسانیی کاکڵەکەی دەردێت و کاکڵەکەی پاك و جوانە. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣) ف [سالم است، گردوی مغزدار گردویی است که به آسانی مغزش بیرون آید. هسته‌ی پاک و تمیز دارد]

**وەك گوێزی ئازای لێ هاتووە:** [بە تەواوەی چاك بووەتەوە]. ف بە کلی از چنگال بیماری نجات پیدا کرده است. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥١)

**وەك گوێزی بە ئەژمار وایە :** کەم و زیاد ناکا. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣) ف [نه افزایش می‌یابد نه کاهش.]

**وەك گوێزێ بە دیواردا بدەی وایە :** [لە قسەی کەس تێناگەی و ئامۆژگاری کەس بە گوێیا ناچێ. گوێ بۆ قسەی کەس ناگرێ]. ف‌تأثیر نکردن سخن و نصیحت در کسی. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٢)

**وەك گوێلکی (گوێرەکەی) گێژ وایە :** [واتە بێمەبەست و ئامانج بەملا و ئەولادا ئەخولێتەوە و ئەڕوات]. ف بی‌مقصد و بی‌هدف این ور و آن ور می‌رود. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٢)

**وەك گوێی (گوێچکەی) کەر جووتن :** بە دووکەس دەوترێت کە زۆر پێکەوە دۆست و گونجاو بن، بۆ پێکەنین و گاڵتە وایان پێ دەڵێن. (جلال محمود بەرگی١ . ٤٧٨) ف [به دو دوست بسیار صمیمی که با هم کنار آمده باشند گویند برای خنده و شوخی به آن‌ها گفته می‌شود.]

**وەك گێسك لە دایکی خۆی:** بە یەکێك ئەوترێ کە فوو لە دۆ نەکا. یان کاری بقە نەکا. (خاڵ.پ.٤٧٤) ف [ریسک نمی‌کند.]

**وەك گیسکەی (بزنەکەی) هەیاس :** [بزنەکەی هەیاس، بزنێك بووە هەر کاتێ قەڵە ئەبووە، گورگیان پێ نیشان ئەدا و ئەویش ئەترساو لەڕولاواز ئەبووە. منیش هەرکاتێ شاد و بەکەیف بم شەڕ و کێشەیکم بۆ ساز دەکەن و لە کوڵم ئەبەنەوە.] ف هەیاس نامی، بزی داشته است که هرگاه چاق می‌شد گرگی را به او نشان می‌دادند و از ترس لاغر می‌شد. من نیز هر وقت شاداب و سرحال هستم ناراحتی و مشکلی را برایم فراهم می‌کنند و خوشی و لذتی را که دیده‌ام از دماغم بیرون می‌آورند. (حیرت.٥٣١)

**وەك گیسكی دەرباز بووی دەستی قەسابە:** چاو ترساوی کارەساتێکی گەورەیە. (جلال محمود بەرگی ا. ٤٧٨) **ف** [از رویداد ناگوار و مهم درس عبرت گرفته است.]

**وەك عەجنە:** [ ١) بە یەکێکی چالاك و زیرەك ئەڵێن ٢) بەیەکێکی ناشیرین ئەڵێن ٣) بە یەکێك ئەڵێن کە زوو لەبەرچا ون ئەبێت.] **ف** ١) چست و چالاک ٢) کریەالمنظر ٣) غیبشونده. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك عەرعەر:** [عەرعەر= جۆرێ دارە. بە یەکێکی بالابەرز و هەڵچوو ئەڵێن] **ف** بە کسی کە قدی بلند و قامتی راست دارد گویند. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك غەریبەکان:** [بە یەکێکی پەریشان و ملکەچ ئەڵێن بە دوور لە کۆمەڵ، کز و خەمبار دانیشتبێ] **ف** بە کسی گویند کە بە دور از جمع و با گردنی کج و پریشان نشستە باشد. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك فۆتەی حەمامە ـ پەشتەماڵی حەمامی، هەر دەمە بە بەریە کێکەوەیە:** بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە هەردەمە لەگەڵ یەکێکدا، دەستەیەکدا بێت. بێبار، هەڵپەرست. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥٢) **ف** [برای رسوایی است کە هر لحظە با کسی، دستەای باشد. بیسود و فرصتطلب است.]

**وەك فرفرە:** [چالاك و زیرەك] **ف** چابک و چالاک. (حیرت. ٥٤٦)

**وەك فوارە:** [بە خوێنێ دەڵێن کە ناکاو فیشقە بکات] **ف** بە خونی جهندە و در حال فوران گویند. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك فیشەك ئەچێ بە ئاسمانا:** [بە یەکێکی توورە و ئاڵۆز ئەڵێن] **ف** بە شخصی عصبانی و خشمناک گفتە میشود. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك فیشەك دەردەپەڕێت:** خێرا دەردەپەڕێت. (جلال محمود بەرگی ئـ٢. ١٥١) **ف** [زود و سریع بیرون میپرد.]

**وەك فیشەکە شێتە بە ئاسماندا چوو:** رقی هەستا و توند بوو زۆر توورە بوو. (جلال محمود بەرگی ا. ٤٧٦) **ف** [بە کسی گویند کە بسیار عصبانی و خشمگین شدە باشد.]

**وەك فیلْ:** [بە یەکێکی قەڵەوی و کەڵەگەت دەڵێن] **ف** بە شخصی بزرگ جثە گفتە میشود. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قاتر ئەچێ بە رێگادا:** [ ١) بە کەسێك ئەڵێن کە لە رێگەوچووندا تەقەی پای بێت ٢) بە کەسێك ئەڵێن کە زنجیری پێوە بێ یان زێڕ و زێوی زۆری لەخۆی دابێت و لە رێگەوچووندا زرەی بێت.] **ف** ١) با سر و صدای زیاد راه

رفتن ٢) بە کسی کە زنجیری را بە او آویختە باشند یا زر و سیم زیادی را بە خویش آویزان کردە باشد. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قاپ قومارخانە:** [هەر جارێك وا بەلای یەکێکەوە و بە مەیلی خۆی دەسوورێتەوە. بە ژنی بەرەڵا دەڵێن] **ف** هر لحظە در دست کسی است در وصف زنی هرجایی است. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قاپی دەمی سەگ وایە:** بە شتێك دەوترێ کە پیس و چەپەڵ دەمیانی تێ ژەند بێت. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) **ف** [بە چیزی گفتە می‌شود کە چرکینی بە آن سیخونک زدە باشد.]

**وەك قارچ هەڵتەتۆقێ:** [بە منالێك ئەڵێن کە زوو گەورە بێت و فرەتر بۆ کچ ئەڵێن] **ف** در مورد کودکی زودرس و سریع‌الرشد بیشتر در مورد دختر بە کار می‌رود. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قاڵاو:** [ ١) لە رەشیدا ٢) لە هەواڵی ناخۆش گەیاندن] **ف** ١) در سیاهی ٢) در خبر بد رساندن. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قەل هەردە قرینێ:** زمانی باش نایەت، ناهێنێت، هەر نوقڵانەی خراپ لێ دەدات. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) **ف** [نیستش خوب نیست. همەاش نفوس بد می‌زند.]

**وەك قەڵەم:** بە ئەنگوست یان لووتی رێك و باریك ئەڵێن. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) **ف** [بە انگشت یا بینی ظریف و باریک گویند.]

**وەك قەلی بە چل ساڵ بارە:** بە یەکێك ئەڵێن کە پیریش بێت، هەر جوان بنوێنێت و دەربەست هیچ نەیەت و گوێ بە هیچ نەدات. وەك دەڵێن «بە چل ساڵان بارن تووشی تووش نایەن و کۆسپ و بارن». (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) **ف** [بە پیری گفتە می‌شود کە جوان بە نظر می‌رسد و دربند هیچ نباشد و بە هیچ چیزی گوش فرا ندهد. معنی شعر در سن چهل سالگی هنوز جوان هستند و دچار گرفتاری و بلا نمی‌شوند.]

**وەك قەلێ هەر دەقرێنێ:** [زمانی باش ناهێنێت، هەر نوقڵانەی خراپ لێ دەدات]. **ف** فال بد می‌زند. (فتاحی قاضي بەرگی ا. ٤٤٩)

**وەك قەن ماڵە دەوڵەمەن:** [ ١) بە شتێکی کەم و دەسنەکەوتوو دەڵێن ٢) بە یەکێك دەڵێن کە نادیار و کەمتر دەرکەوێ] **ف** ١) بە چیزی کم و نایاب گویند ٢) بە شخصی گویند کە کمتر در انظار عموم ظاهر شود. (حیرت. ٥٤٨)

**وەك قەن:** [بە میوە یان لێوی شیرین ئەڵێن] **ف** بە میوە یا لبی شیرین گفتە می‌شود.

(حیرت. ٥٤٨)

**وەك قەور:** [بە جێگایەك تەنگ و تاریك و تەنگەبەر دەڵێن] **ف** بە جایی تنگ و تاریک گویند. (حیرت. ٥٤٨)

**وەك قرژانگ:** [ ١) لاروگێڕ ڕۆیشتن، لاڕێی ٢) بۆ دوا ئەچێ و لە نەهاتیدایە ٣) ناشیرین و بەدئێسك] **ف** ١) کجرو ٢) واپسرو ٣) کریه و بدشکل. (حیرت. ٥٤٧)

**وەك قرنووی (گەنە ):** بە پیاوەوە دەنووسی، بۆ سووکی بە کەسێك دەڵێن کە بە زۆر خۆی بۆ کارێك، کەڵکێك، ئامانجێك بە یەکێکەوە هەڵ بواسێت لەو کەسە نەبێتەوە. دەڵێن وەك قیروزفتە، لێی نابێتەوە. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٢) **ف** [برای رسوایی است بە کسی کە بە اجبار برای کاری، سودی، هدفی بە کسی دیگر بچسبد و از او جدا نشود و نیز گویند مانند قیر بە او چسبیده و جدا نمی‌شود.]

**وەك قنگ عەنتەر:** [ ١) بۆ تانە و تەشەرە ٢) ڕوومەتی سوور] **ف** ١) طنز و تعریض ٢) با طنز برای کسی کە چهرەای سرخ داشته باشد. (حیرت. ٥٤٨)

**وەك قنگ لاشك:** [بە شتێکی وشك و سووك ئەڵێن] **ف** چیزی خشک و سبک. (حیرت. ٥٣٦)

**وەك قورئان پاك و بێعەیبە:** [بە مرۆڤی بێسووچ و تاوان ئەڵێن] **ف** بە شخصی بیگناه گویند. (حیرت. ٥٤٨)

**وەك قوڕی (هەڕگ) زستان عافوو:** واتە لێی ناگیرێت و چاو پۆشی لێ دەکرێت، چونکە ناتەواوە. ئیتر ناتەواو بیەکەی هی هەر چی بێت. (جلال محمود بەرگی١. ٤٧٦) **ف** [از او هیچ انتظاری نمی‌رود و می‌توان از اعمال او چشم‌پوشی کرد چون فردی ناتوان و عاجز است حال ناتوانیش بە هر دلیلی کە باشد.]

**وەك کۆتر زوو دەگەڕێتەوە:** واتە بە وەفایە و بە ئەمەگ. (جلال محمود بەرگی١. ٤٧٧) **ف** [وفادار است.]

**وەك کۆتر:** [بە یەکێك ئەڵێن کە بە ناز و خەمزە بڕوات بە ڕێگادا] **ف** راه رفتنی با ناز و خرامان. (حیرت. ٥٤٩)

**وەك کۆپان کەر:** [بە جلوبەرگی ئەستوور و نەپۆڕ و نارێك دەڵێن.] **ف** بە جامەی ستبر و بد دوخت و بی‌قوارە گفته می‌شود. (حیرت. ٥٤٩)

**وەك کۆپان ناوموڵ:** بە یەکێکی بێبایەخ و هیچ لێنەهاتوو و پیس دەڵێن. **ف** بە شخصی بی‌ارزش و کثیف و ناشایسته گویند.

**وەك کۆزەرەی گەنمە تالێی دەیت لێی هەڵدەوەرێ:** ساڵان دەرەبەگەکان وایان بە

جووتیارەکان دەگوت. واتە تا بیچەوسێنیتەوە بەهرەی زۆرترە. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)
ف [در گذشته مالکین به رعیت این‌طور می‌گفتند. هرچه آن‌ها را به رنج و زحمت وادارید بهره‌شان بیشتر است.]

**وەك كارگ (قارچك) هەڵتۆقی:** ١) زوو پێگەیشت و گەورە بوو، زوو باڵای کرد ٢) زۆر زوو دەوڵەمەند بوو. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) ف ١)[زود رشد کرد و بزرگ شد و قد کشید] ٢)[زود ثروتمند شد.]

**وەك كاسەی چەور هیچ ناگرێتە خۆی:** بە یەکێکی بێحەیا ئەوترێ کە هیچ قسەیەکی خراپی پێ عەیب نەبێ و بیساوێ بە خۆیا. (رخزادی. ٤٠١) ف[به کسی بی شرم و حیا گفته می‌شود که مقید هیچ حرف زشتی نباشد و آن را تحمل کند].

**وەك كە پەكی لێهاتووە، بە پەینكەی خۆی نابێ:** بە یەکێك ئەوترێ کە لەبەر ئیش و کار زۆری سەری لێ شێوا بێ و ئیشەکانی لە یەك پچڕا بێ. (خاڵ.پ.٤٧٣) ف [به کسی گفته می‌شود که به علت کار و فعالیت بسیار پریشان حال و کارهایش از هم گسیخته شود.]

**وەك كەر (بێساحێو) (بێخاوەن):** [بە لاوێکی بێکار و بەتاڵپا ئەوترێ] ف به جوانی بیکار و ولگرد گفته می‌شود. (حیرت. ٥٤٩)

**وەك كەر بە تەپكەیەوە بووە:** تووش جێگایەکی خراپ بووە. ف بدجایی گیر کرده است. (فتاحی قاضي بەرگی١. ٤٤٩)

**وەك كەر بە دەنگە جۆ دەزەڕێ (دەسەڕێنێ):** بە کەسێك دەڵێن کە زوو خۆی لێ بگۆڕێت بە، ماڵی دنیا پایە یەك یان بە هەر شتێکی تر. خوێڕی و بێنرخ. (جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٢)
ف [به شخصی گفته می‌شود که زود دگرگون و متحول شود. حال به واسطه‌ای شخصی دیگر، ثروت دنیایی، مقامی یا به هر وسیله‌ی دیگری که باشد.]

**وەك كەر بێگار:** [بە یەکێك ئەڵێن کە بێپاداش و کرێ بۆ کەسانیتر کار دەکات.]
ف به کارگری بی‌اجر و مزد گفته می‌شود که مجانی برای دیگران کار می‌کند. (حیرت. ٥٤٩)

**وەك كەر گوێی خۆی شۆڕکردۆتەوە:** گوێی خۆی تەپ کردووە: بێ دەسەڵاتانە خۆی داوەتە دەست ناحەق. (جلال محمود بەرگی ئ٢. ١٥٢) ف [ناتوان است خویش را به دست ناحق سپرده است.]

**وەك كەر و جاش وان:** [بە دوو کەس ئەڵێن کە هەموو کاتێ بە یەکەوە بن و لە یەك جیا

نەبنەوە]. ف به دو نفر می‌گویند که همیشه با هم باشند و از هم جدا نشوند. *(فتاحی قاضي بەرگی٢. ٢٧٨)*

**وەك كەر:** [به یەکێکی نەزان و بەتاقەتو کۆڵ هەڵگر دەڵێن.] ف نادان، بردبار، باربر. *(حیرت. ٥٤٩)*

**وەك کەروێشکێ دە پنگەڵێ ( پوونگە ) خزاوە:** [به منداڵێك دەڵێن کە لە ئامێزی باوك و دایکیدا پاڵ کەوتبێت]. ف به بچەای گفته می‌شود که در آغوش پدر و مادر لمیده باشد. *(فتاحی قاضي بەرگی١. ٤٥١)*

**وەك کەری دەروێش سەر بە هەموو ماڵێکا ئەکا:** به یەکێك ئەوترێ کە هاتوچۆی هەموو شوێنێك بکات. *(خاڵ.پ.٤٧٣)* ف [به کسی گفته می‌شود که به هر جایی و به هر منزلی سر بزند.]

**وەك کەرێ سمی چەقاند:** [لە شوێنی خۆی دایکوتاوە و نابزوێ. رقی بۆ شتێك گرت.] فدر جای خودش میخکوب شد و لج کرد. *(فتاحی قاضي بەرگی١. ٤٥٠)*

**وەك کەری ناو جۆگەیە:** به یەکێك ئەڵێن کە هەڵپەی دوولا یان پتر بکات، بۆ خواردن، بو کاسبی، به گەمەوە یان بۆ سووکی وای پێ دەڵێن. جاسووسی دولایەن. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٢)* ف [به کسی گفته می‌شود که سعی کند که از دو طرف استفاده نماید چه برای خوردن، یا کاسبی باشد به شوخی یا برای رسوایی این‌طور به او می‌گویند. جاسوسی دو طرفه.]

**وەك کەری ناو قوڕاو ( هەڕگاو ) گیری خواردووە:** به تەوس و گاڵتە پێ کردنەوە بە کەسێك دەڵێن کە لە کارێکدا پەکی کەوتبێت و چارەسەری خۆی پێ نەکرێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٧)* ف [با طعنه و شوخی به کسی گفته می‌شود که در کارش دچار مشکل یا اتفاقی شده باشد و نتواند خود را از آن رهایی دهد.]

**وەك کتك سەرچنار:** [کەسێك کە زۆر سووکایەتی پێ کرابێ و زۆریان لێ پرسیبێتەوە] ف وصف‌الحال کسی است که زیاد توهین و ناسزا دیده و استیضاح شده باشد. *(حیرت. ٥٤٩)*

**وەك کتك:** [ ١) بێئەمەك ٢) بە کەسێك سپڵە و پێنەزان یان کەسێك کە نان و نمەکی کەسانی‌تری لەبەرچاوی نەبێ ئەڵێن.] ف ١) بی‌وفا و نمک‌نشناس. *(حیرت. ٥٤٩)*

**وەك کەڵەشێری ناوەخت وایە:** بە یەکێك ئەوترێ کە هەموو کارێکی لە ناوەختا بێ. *(خاڵ.پ.٤٧٣)* ف[به کسی گفته می‌شود که

همه کارهایش را بی‌موقع انجام دهد.]

**وەك کەڵەکی سەر ئاو وایە:** واتە هەمیشە لەبەر شەپۆلدایە. لە مەترسی دایە و سرەوتی نییە، لە هەڵتەك و داتەك دایە. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۱۵۲)* **ف** [همیشه با خطر امواج مواجه است و آرام و قرار ندارد و پریشان است.]

**وەك کەنوو:** [بە یەکێکی فرە قەڵەو و کورتە باڵا دەڵێن] **ف** بە شخصی بسیار چاق و کوتاەقد گویند. *(حیرت. ۵۵۰)*

**وەك کەو ئەچێتە ڕێگا:** [بە لاوێك ئەڵێن کە بە لەنجە و لار و ناز دەڕوات بە ڕێگادا] **ف** بە جوانی گفته می‌شود که با ناز و کرشمه راه برود. *(حیرت. ۵۵۰)*

**وەك کەو چوو:** بە یەکێك ئەوترێ کە بە قسەیەك یا بە بینینی یەکێك وا بچێ قسەی بۆ نەکرێ. *(خاڵ.پ.۴۷۳)* **ف** [بە کسی گفته می‌شود که به محض شنیدن سخنی یا دیدن کسی بطوری منقلب و دگرگون شود که دیگر نتواند حرف بزند.]

**وەك کەو وایە کە گرتت لەفڕ دەچێ:** زوو لە دەست دەچێت و بەڵام زووکۆڵ نادا و خۆی بە دەستەوە نادا. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۱۵۳)* **ف** [زود از دستت می‌رود و خود را تسلیم نمی‌کند.]

**وەك کەوڕێشك:** [توند و چالاك و زیرەك] **ف** تند و چابک. *(حیرت. ۵۵۰)*

**وەك کوردەکەی لە هەردوو جەژن بووگ! (بوو):** کەسێ کە دوو کار یان دوو بەش بێ بەش بێ. هەم لەم لا بووە و هەم لەولاش. *(رخزادی. ۳۹۹)* **ف**[از دو طرف محروم شد].

**وەك کوڕی بابی خۆی:** [بە یەکێك دەڵێن کە نەترسانە و بێباکانە دەس بە کارێکەوە بدات. کوڕێکی هەڵکەوتە کە بتوانێ جێی بابی بگرێتەوە.] **ف** به کسی گفته می‌شود که با زیرکی و بدون پروا و ملاحظه به کاری اقدام و مبادرت کند. *(فتاحی قاضي بەرگی۱ ۴۴۹.)*

**وەك کوڕی حیکایەت پێگەیشت:** بە یەکێك ئەڵێن کە زوو و بگاتە پایە، یان سامانێکی زۆر و دەسەڵاتداری پەیدا بکات. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۱۵۲)* **ف** [به کسی که زود به درجه و مقام یا ثروت برسد گویند، یا زود به قدرت و حاکمیت نایل شود.]

**وەك کوڕی شا وایە:** ۱) دەوڵەمەند و بەدەستە ۲) ڕێك و پێك پۆشە، هەڵس و کەوتی جوان و شازادانەیە. *(جلال محمود بەرگی۲ . ۱۵۳)* **ف** ۱)[ثروتمند و قدرتمند است.] ۲)[شیک‌پوش ، نشست و

برخاستنش زیبا و شاهانه است.]

**وەك كولاشدەم (دوو پشك، دوومارەكۆڵ) حەوت گرێی هەیە:** زۆر بەوەزنەدە و زمان پیسە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)* **ف** [بسیار آزاردهنده است.]

**وەك كونای دەرزی:** [بە یەكێك ئەڵێن كە چاوی زۆر چكۆلەی بێت.] **ف** چشمی بسیار تنگ و ریز. *(حیرت. ٥٤٩)*

**وەك كوندەی ـ گۆزەی سەربەرەو ژێر باران دێتە خوارێ:** زۆر بە خوڕەم دەبارێت. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)* **ف** [بسیار به شدت می‌بارد.]

**وەك كونی كەیت وایە:** ئەو ڕێگەیەی پێدا دەڕۆیت زووتر دەتگەیەنێتە شوێنی بۆچوون. نزیكی دەكاتەوە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)* **ف** [آن راهی را كه ادامه می‌دهید زودتر تو را به مقصد می‌رساند و تو را نزدیك‌تر می‌كند.]

**وەك كوێر پەل دەكوتێت ـ دەهاوێت ـ هەنگاو دەنێت:** بە كەسێك دەڵێن كە بێ بیركردنەوە كار دەكات. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٣)* **ف** [به كسی گفته می‌شود كه بدون تفكر و اندیشه كاری را انجام می‌دهد.]

**وەك كوێر:** [ ١) مرۆڤی نەخوێندەوار٢) گێل و حۆل] **ف** ١) شخص بی‌سواد ٢) خنگ و سفیه. *(حیرت. ٥٤٩)*

**وەك كێرد (كارد) و پەنیر وان:** [دوژمن و نەیاری یەكن]. **ف** با هم دشمنند. *(فتاحی قاضی بەرگی١ .٤٥١)*

**وەك كیسەڵ:** [سەری بردووەتە ناو خۆی یان كەوتووەتە ناو خەم و پەژارە زۆر بە ئارامی دەڕوا یان كار دەكات.] **ف** سر به كتف كشیده. در راه رفتن یا كارش بسیار كُند است. *(حیرت. ٥٥١)*

**وەك كێشكەی بەچلانە:** بە خواردنێكی كەم ئەوترێ كە لەبەر دەمی چەند زەلامێكا دابنرێ. واتە ئەم خواردنە وەك چۆلەكەیەك وایە كە بۆ چل كەس دابنرێ. *(خاڵ.پ.٤٧٣)* **ف**[به غذایی كم و ناچیز گفته می‌شود كه پیش چند نفر بگذاری.]

**وەك كێف (كێو)** پتەو و قایم. **ف** [محكم و پا برجا]

**وەك لۆتی پای تەشت:** [بە مرۆڤی رووت و قوتی بێجلوبەرگ ئەڵێن] **ف** به شخصی لخت و عاری از لباس و پوشاك گویند. *(حیرت. ٥٥٢)*

**وەك لۆك گەرم داهاتووە:** توورە و توند و تیژ بووە. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٣)* **ف** [خشمگین و تند است.]

**وەك لۆكە:** [بە زوڵف یان ریشی سپی و نەرم ئەڵێن.] **ف** به گیسو یا ریش سفید و نرم

گفته می‌شود. (حیرت. ٥٥٢)

**وەك لافاو لە ژێری ئەڕێ:** [مانگانەی خوێنی عادەتی ژنان] **ف** خون حیض یا نفاس زنی که جاری است. (حیرت. ٥٥٢)

**وەك لافاو:** [بە فرمێسك و ئارەق، باران، یان خوێنی زۆر ئەلێن] **ف** به اشک، عرق، باران یا خونی فراوان گویند. (حیرت. ٥٥٢)

**وەك لە بانێکم بەردەیتەوە وابوو (ئیژی لەبان داکەوتم):** زۆر سەرسام بووم. سەیرم لێ‌هات، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد. (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٣) **ف** [بسیار متحیر شدم، تعجب کردم، چنین انتظاری نداشتم.]

**وەك لە پەی دە هەموو چێشتاندا هەیە (وەك نۆك ناو ئاشە):** [خۆی ئەکوتێتە نێو هەموو کاروبارێك]. **ف** دخالت بیجا در کار دیگران کردن. (فتاحی قاضي بەرگی١. ٤٥٣)

**وەك مۆریانە ناوسك بنیام ئەخوا:** [١) منداڵ لاڕێ ٢) هاودەمی ناجۆر و ئازاردەر] **ف** ١) اولاد ناخلف ٢) مونس ناباب و آزاردهنده. (حیرت. ٥٥٤)

**وەك مۆم لە دەستی وایە:** [واتە گوێڕایەڵیەتی]. **ف** مطیع و فرمانبردار اوست. (فتاحی قاضي بەرگی١. ٤٥٥)

**وەك مۆم:** [١) نەرم ٢) گوێ ڕایەڵ] **ف** ١) نرم ٢) رام و مطیع. (حیرت. ٥٥٤)

**وەك مار ئە پێچگێ:** [واتە دەرد و ئازاری زۆرە] **ف** در اثر درد و شدت ناراحتی. (حیرت. ٥٥٣)

**وەك مار پێچی خوارد (کینگلی خوارد):** بە ژانەوە یان بە خەفەتەوە تلاوتلی کرد. (جلال محمود بەرگی١. ٤٧١) **ف** [از شدت درد یا غم و غصه تلو تلو می‌خورد و غلط می‌زد.]

**وەك مار پێوەی دا:** زیانێکی گەورەی پێ گەیاند، لە ناکاوا بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت جزەی گەیاندێ (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤) **ف** [آسیب مهمی را به او رساند بدون آن‌که خودش بفهمد.]

**وەك مار مەکانی بۆ نییە:** بە یەکێك ئەڵێن جێگە بە خۆی نەگرێت، هەردەمە لە شوێنێك بێت یان لەبەر ڕەت بڵاو یی، سرەوت و ئارامی نەبێت. (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤) **ف** [به کسی گفته می‌شود که جا و مکان مشخصی ندارد و در هیچ جایی آرام و قرار ندارد و هر لحظه در جایی باشد.]

**وەك ماری بێ ئیجازە وایە:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر خراپ بێ و هەرگیز لێی دڵنیا نەبن. جیگای مەترسییە. (خاڵ.پ.٤٧٤) **ف** [به کسی بسیار بدکار گفته می‌شود که هرگز نباید به او اطمینان داشت. گزنده و

خطرناک است.]

**وەك مـاری پـێ لەسـكە :** بـە كەسـێكی رووالـەتباشـی دەروون خـراپ دەڵـێن. *(جلال محمود بەرگی ١. ٤٧٨)* **ف** [بـە كسـی كـه ظاهرش خوب ولی در باطن بد باشد.]

**وەك ماری پێ لە زگە :** بە یـەكێك ئـەوترێ كـە بیری خۆی هـەرگیز دەرنـەبڕێ. *(خاڵ.پ.٣.٥٨)* **ف**[به شخصی گفتـه مـی‌شـود كـه هرگـز عقاید خود را آشكار نكند.]

**وەك ماری كلك قرتاو وایە :** بـە گـڕدا دەچـێ. هەمیشە لە تۆڵە دەگەڕێ. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٤)* **ف** [گلاویـز مـی‌شـود و حملـه می‌كند و در فكر انتقام است.]

**وەك ماسـی بـێـگێـرد وایـە :** [مرۆڤێكـی سەربەسـت و دڵپاكـە]. **ف** انسـان آزاده و بی‌غل و غش. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٤)*

**وەك ماسی وایە جارێك سەر ئاو و جارێك ژێر ئاو دەكەوێت :** بـە یـەكێك دەوترێـت لـە هـیچ ئـەركێكی بەسـەرەوە نـەبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٩)* **ف** [به كسی گفته می‌شود كه هیچ وظیفه‌ای بر عهده نداشته باشد.]

**وەك ماسییێك لە ئاو بڕیا بێ (لـە ئـاو بـڕاو) :** [بە یەكێكی نائارام و ئوقرەنەگەرو هەراسـان دەڵێن]. **ف** به شخصی بیقـرار، ناشـكیبا و آشـفته و مضـطرب گوینـد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٤)*

**وەك مـاڵی قـەرەتاژە دییـە :** نـان بـدە و بەخشـندەیە. قـەرەتاژدین یاریـدەرو دڵسـۆزی مـەم، زاوای مـیری زەینـەدین لـە هەنـدێ ریوایەتی مەم و زیندا. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٤)* **ف** [سخاوتمند است.]

**وەك مامەخەمە وایە :** بە یەكێك ئەوترێ كە بۆ هـەموو شـتێك خەفـەت بخوا. *(خاڵ.پ.٤٧٥)* **ف**[به كسی گفته مـی‌شـود كـه بـرای هـر كسی یا هر چیزی غم و غصه بخورد.]

**وەك مامر ئاسیاوان :** [بێبـاك و رووداماڵراو] **ف** جسور و پررو. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك مـامر ئـاوەڕووت كریـاگ (كـراو) :** [ ١) جەستەیەك كە بە بۆنـەی سـووتیانەوە پێسـتی گیرابێتـەوە ٢) سـەری سـاف و تاشـراو] **ف** بدنی كه بر اثـر سـوختگی پوسـتش كنـده شده باشد. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك مانگ نەدرۆشێ :** [بـە یـەكێك ئـەڵێن كـە روومـەتی جـوان و سـاف و بێگـەردی ببێت. ئافرەتی جوان] **ف** به كسی گفته می‌شود كه چهره‌ای زیبا و شفاف داشته باشد. زن زیبا. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك مانگەشەو :** [ ١) شـتێكی روون و ئاشـكرا ٢) روومـەتی جوان و بێگـەرد] **ف** ١) چیـزی واضح و روشن ٢) چهره‌ای زیبـا و شـفاف.

(حیرت. ٥٥٣)

**وەك مەخمەڵ:** [بە شتێکی نەرم و نیان و ناسك ئەڵێن.] ف بە چیزی نرم و لطیف گفته می‌شود. (حیرت. ٥٥٤)

**وەك مەڕی سەربڕاو وایە:** [بە یەکێکی ئارام و بێدەنگ دەڵێن]. ف بە شخص ساکت و آرام گویند. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٤)

**وەك مەستی لە ئاوی دەی:** دەستبەجێ و بە هاسانی کارەکە جێبەجێ بوو. (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤) ف [سریع و آسان کار انجام گرفت.]

**وەك مەیموون:** [بە یەکێك کە ڕەفتاری پێکەنینی و ڕواڵەتی ناشیرین بێ ئەڵێن.] ف به کسی گفته می‌شود که حرکاتی مضحک و صورتی زشت داشته باشد. (حیرت. ٥٥٤)

**وەك مراوی قەت تەڕ نابێ:** [بە مرۆڤی فێڵباز دەڵێن کە ناکەوێتە داو]. ف شخص خلاف کاری که با فوت و فنی که بلد است نمی‌گذارد عواقب کارهای خلاف دامنگیرش شود. (فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٤)

**وەك مردگ ماموٚخ:** [بە مرۆڤێك ئەڵێن کە بیەوی بە بیانووی جۆراوجۆر خۆی کەساس و مردارەوبوو پیشان بدا.] ف بە شخصی می‌گویند که به بهانه‌های گوناگون خود را بە مردگی و پریشان‌حالی و بینوایی و محتاجی بزند. (حیرت. ٥٥٣)

**وەك مردگ:** [ ١) بێ‌هەست و جموجووڵ ٢) لەڕ و لاواز ٣) نووستنی قورس] ف ١) بی‌حس و بی‌حرکت ٢) ضعیف و نحیف ٣) خوابی سنگین. (حیرت. ٥٥٣)

**وەك مریشك (مامر) لە کڕ چوەتەوە:** [بە پێچەوانەی رابردوو ئێستا ئیتر کەڵکێکی نییە. هونەر و زەوقی جارانی نەماوە]. ف برخلاف گذشته الان وجودش مثمرثمر نیست. (فتاحی قاضي بەرگی٢ .٢٧٩)

**وەك مریشك (مامر) وایە، لەسەر خەرمانی گەنم هەڵیگرە لە گوودا چینە ئەکا:** بە یەکێکی پەست ئەوترێ کە لە پیشەیەکی بەرز بیهێنە خوارەوە بچێ دەست بداتە کارێکی نزم و خراپ. (خاڵ.پ.٤٧٥) ف [به شخصی رذیل و پست گفته می‌شود که از شغلی عالی و مهم او را برکنار کنند و بعد به کارهای خلاف و پست روی آورد.]

**وەك مسی سەرمەنوونەتوایەوە:** لە تەریقی و شەرمەزاریدا، لە خەفەتدا نیوەی نەما و لاواز و لەڕ بوو و هەڵگەڕا. مەنوومە: ئامێرێکە، مس و ئاڵتوونی تێدا دەتوێننەوە. (جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤) ف [از شرمندگی و از

غم و غصه لاغر و ضعیف شده است.]

**وەك مشك بان قالب ساون:** [بۆ گاڵتە بە منداڵێك کە ژێر دانیشتبێ ئەڵێن.] **ف** به مزاح: بچه‌ای که آرام و مؤدب نشسته باشد. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك مشك سەرخەزانە:** [سەبارەت بە خزمەتکارێ یا ژنێکە کە لە نێو ماڵێکی پڕ لە تفاقدا ئەژێ و ئازادی و دەسەڵاتی تەواوی هەبێ] **ف** در مورد کلفت و نوکر و یا زنی گویند که در خانه‌ای پرآذوقه و نعمت اختیار تام داشته باشد. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك منال:** [بیانووك گیر و بێئارام و قەرار] **ف** بهانه‌گیر و ناشکیبا. *(حیرت. ٥٥٣)*

**وەك موجەسەمە - دیوار -:** [بێجوڵە و بێدەنگ] **ف** خشک و بی‌صدا و بی‌حرکت. *(حیرت. ٥٥٤)*

**وەك مووڕووی غەیبییە:** واتە زوو لە چاو ون دەبێت و کەس نازانێت کەی و بۆ کوێ دەچێت. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤)* **ف** [زود از نظرها پنهان می‌شود و کسی نمی‌داند به کجا می‌رود.]

**وەك مووسایی:** [بە بچووکترین دەرد و ئازار ئەناڵێنێ و هاوار دەکات. ترسنۆك] **ف** با کوچکترین آزاری داد و فریاد راه می‌اندازد، ترسوست. *(حیرت. ٥٥٤)*

**وەك موویەك لە ماست دەربهێنێت:** واتە زۆر بە ئاسانی. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤)* **ف** [بسیار به آسانی انجام‌پذیر است.]

**وەك مێش شلخەی دابێ:** واتە خەڵکێکی زۆر کۆ بووەتەوە و بە یەکدا دەدەن. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤)* **ف** [جمعیت بسیاری جمع شده با همدیگر درگیر و بهم می‌زنند.]

**وەك مێشە (مەگەزە) لە هەموو شتێك دەنیشێت:** بە یەکێك دەڵێن کە زۆر دنیایی و دراوپەرست بێت تەماع وای لێ بکات گوێ نەداتە هیچ نەنگی و شەرمێك و بە هەموو شتێکیش قایل بێت. گەندپەسەندی پیس‌خۆر. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٩)* **ف** [به کسی خسیس و مادی گفته می‌شود که طمع او را وادار کند که از هیچ ننگی ابایی نداشته باشد و به همه اعمال ننگینی قایل و راضی باشد.]

**وەك مێو نەرم بوو:** ملی ڕێکەوتن و گونجانی داوە، شل بوو. بۆ کارەکە رازی بوو. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٤)* **ف** [راضی به کنار آمدن و توافق رسیده است.]

**وەك مێوە - هەویرە - لە دەستیدا - بە دەستیەوە:** چۆنی بۆێت وای دەسووڕێنێت سەرپێچی ناکات. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٥)* **ف** [هر طور بخواهد او را می‌چرخاند وی

نیز سرپیچی نمی‌کند.]

**وەك نان دەیناسم:** نان هۆی ژیانە و چێژی هەمیشە لە دەمدایە. واتە زۆر چاك هەموو چاکی و خراپییەکی دەزانم. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٥)* **ف** [بسیار خوب از همه نیکی‌ها و بدی‌هایش آگاهی دارم.]

**وەك نەخۆش ژەمەن بگردگ:** [بە مرۆڤێك ئەڵێن کە چاوبرسیانە خواردەمەنیەك بخوات.] **ف** کسی که با ولع غذا بخورد. *(حیرت. ٥٥٤)*

**وەك نەقیزە:** [بە شتێکی تیژ و ئازاردەر دەڵێن.] **ف** به چیزی تیز و خار مانند و آزاردهنده گویند. *(حیرت. ٥٥٤)*

**وەك نووسەکەی (نووسنەك) ـ قییر ـ پێوە دەنووسێ:** [لە کۆڵ نابێتەوە و دەستهەڵگر نییە]. **ف** ول کن معامله و دست‌بردار نیست. *(فتاحی قاضي بەرگی٢. ٢٧٩)*

**وەك نوێژی قەزا پێی گێڕایەوە:** واتە هەموو قەرزەکەی لێ سەندەوە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٤)* **ف** [همه‌ی بدهکاری‌هایش را از او پس گرفت.]

**وەك نێرە کەرەکەی عوزەیر پێغەمبەرە، زەڕینی هەیە و پەڕینی نییە:** بە یەکێك دەوترێت گوفتاری هەبێت و کرداری نەبێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٩)* **ف** [بە کسی گفته می‌شود که گفتار دارد اما عمل ندارد.]

**وەك نیسکێنە زوو هەڵدەچێت:** بە یەکێك دەوترێت کە تووڕە و تڕۆ بێت. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٩)* **ف** [به کسی خشمگین و ناباب و اخمو گفته می‌شود.]

**وەك واشە خۆی پێدادا:** لەپڕ و لە ناکاودا شتەکەی قۆستەوە. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٧٩)* **ف** [ناگهان آن چیز را قاپید.]

**وەك وەنە ئەلەرزێ:** [بە ترساو و توقاو ئەڵێن] **ف** به کسی ترسیده و وحشت‌زده گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك وەوی چینی:** [بە کچۆلەیەکی جوان و رازاوە و خۆش جلوبەرگ ئەڵێن] **ف** به دختری زیبا و آراسته و شیک‌پوش گویند. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك وەوی:** [١) کچ و ژنی رازاوە ٢) ئەسپی خۆش قەڵافەت و خۆش رەفت.] **ف**١) مزین و آراسته ٢) اسبی خوش‌اندام و خوش‌رفتار. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك وردەشیشە:** [١) بە شتێکی ورد و خاش بوو ٢) وردە ئەستێرە یان ئەستێرە چکۆلەکان] **ف** ١) ریز و متلاشی شده ٢) ستارگانی ریز. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك ورچ (بەری پێی) بەر پای خۆی**

**دەلێسێتەوە:** [شتێکی نییە هەتا پێی بژی، نەدار و هەژارە]. **ف** چیزی ندارد که با آن زندگی کند، فقیر و درمانده است. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٥)*

**وەك وشتر لە نزیك دەلەوەڕێ و لە دوور دەڕوانێ:** [داهاتوو لەبەر چاو دەگرێ و تێبینی دواڕۆژ دەکا]. **ف** آیندەنگر و دوربین است. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .٢٧٩)*

**وەك وشترەوان:** [قاقولە یان دورمەی گەورە هەلگردن] **ف** لقمەی بزرگ برداشتن. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك وشتری ناو پەموو وایە:** بە یەکێکی درێژداهۆڵ ئەوترێ کە لەگەڵ چەند منالێکا یاری بکات. *(خاڵ.پ.٤٧٢)* **ف** [بە شخصی بلندقد و لاغراندام گفتە میشود کە با بچەها بازی کند.]

**وەك وڵ (کوڵ) خوێ نییە:** ١) قسەی بەرز دەڵێ. قسەیەکی ئەوتۆی لە رادەی خوێ زیادتر بێ ٢) ئەو ئازاری پێوە ناکێشێت چ باکیەتی. بۆ ئەو کێشە نییە. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٥)* **ف** [حرف گندە میزند، گندەتر از دهنش ٢) او آن آسیب و رنج را نمیکشد چە در بند و مقید است برای او مشکلی نیست.]

**وەك وڵاخی هەر وە سەر دەپەڕێ:** [١) بێباکە و سەرنج نادا] [٢) داب و نەریت نابا بە رێوە]. **ف** ١) بیپروا و بیملاحظە است ٢) آداب و رسوم را رعایت نمیکند. *(فتاحی قاضي بەرگی٢ .٢٧٩)*

**وەك هات هاتی دوای گورگە:** [بە کارێکی بێکەڵك و سوود ئەڵێن کە دوای کارەساتێك بکرێت] **ف** به کاری بیهوده گفته میشود که بعد از واقعه انجام گیرد یا نوشداروی بعد از مرگ سهراب. *(حیرت. ٥٣٩)*

**وەك هەڵۆ دای بە ملیا:** [بە پەلە و خێرا دەست بە خواردنی پێخۆرێك کردن] **ف** با عجله شروع به غذا خوردن کردن. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك هەڵمات وایە باری بۆ نیە:** بە یەکێك ئەوترێ کە هەر ساتێ لە سەر بارێ بێ. *(خاڵ.پ.٣ ٥٨)* **ف**[به کسی گفته میشود که هر ساعتی بر عقیدەای باشد.]

**وەك هەڵوا:** [شیرین و نەرم] **ف** شیرین و نرم. *(حیرت. ٥٥٠)*

**وەك هەلووك وایە:** [لێهاتوو و چالاکە. رۆح سووك و ماندوونەناسە]. **ف** چست و چالاک است. خستگی را نمیشناسد. *(فتاحی قاضي بەرگی١ .٤٥٥)*

**وەك هەلووکێ وایە:** گورج و گۆڵ و چالاکە. *(جلال محمود بەرگی٢. ١٥٥)* **ف** [چست و

چالاک است.]

**وەك هەنار:** [سوور و ئاگرین] **ف** قرمز و آتشین. *(حیرت. ٥٥٦)*

**وەك هەنگوین:** [ ١) میوەی شیرین ٢) منداڵی قسەخۆش] **ف** ١) خربزه شیرین ٢) کودکی خوش زبان. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك هەنیە کۆڵە:** [سەری منداڵ بە هەنی کاڵ و نەگەیشتوو چوێنراوە] **ف** سر بچه را به هندوانه نارس تشیه کردن. *(حیرت. ٥٣٧)*

**وەك هەوانە:** [سکی هەراو و زل] **ف** شکمی چون آن. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك هەور بەهار دای ئەڕژنێ:** [وەکوو هەوری بەهار ئەبارێ و ئەسرین دەڕژێنێ] **ف** مثل ابر بهار اشک می‌ریزد. *(حیرت. ٥٥٥)*

**وەك هەور داگیا بەیەکا:** [ناوچاوی تاڵ و گرژە] **ف** قیافه‌ای درهم کشیده و عصبانی. *(حیرت. ٥٥٦)*

**وەك هەورەتریشقە:** [خێرا و گورج و گوڵ کارێك کردن یان تووڕە هەڵچوو.] **ف** عملی برق‌آسا و سریع انجام دادن، عصبی و از کوره در رفتن. *(حیرت. ٥٥٦)*

**وەك هەورێشم:** [بە لێوی ناسك و باریك ئەڵێن.] **ف** به لبی نازک، رشته‌ای نازک گفته می‌شود. *(حیرت. ٥٥٦)*

**وەك هیزەی فوودراوی لێ هاتووە:** زۆر قەڵەو بووە، ئاوساوە. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٥)* **ف** [بسیار چاق شده و آماس آورده است.]

**وەك هێلکە و ڕۆنی سەر کڵاو ڕۆژنە وایە:** بە ئیشێك دەوترێت کە لە شوێنێك بێت و تۆ لە شوێنێکی دوور هەوڵی بۆ بدەیت کە ئەو هەوڵە بێکەڵك بێت واتە: ئەگەر دەتەوێت ئەو ئیشە سەربگرێت. بچۆ بۆ شوێنێ خۆی لەوێ هەوڵی بۆ بدە. *(جلال محمود بەرگی١. ٤٨٠)* **ف** [به کاری گفته می‌شود که در جایی باشد و تو در جای دورتر از آن برایش تلاش کنید که آن تلاش و کوشش بی‌نتیجه است اگر می‌خواهی کار انجام گیرد برو به جایی که کار در آنجا هست و در آنجا برایش تلاش کن.]

**وەك یەکێ لەبان داکەفێ:** [ئاگادار بوونەوە و سەرسوڕمان] **ف** بیدار شدن و به خود آمدن، تعجب کردن. *(حیرت. ٥٢٨)*

**وەکوو بارگێنی دوای دەوار، ئاو بە چاو یا تێتە خوارەوە:** واتە بە کوڵ دەگری بۆ کار و بۆ بار دەگری. *(جلال محمود بەرگی ٢. ١٥٥)* **ف** [به شدت گریه می کند. برای بارش می گرید.]

**وەمە گوڵۆڵە موو، ماڵ باوکم ئەمداتە شوو!:** ئەمە قسەی قەیرەکچێکە وا بە سامانی

باوکی دڵ خۆشە کە بیدا بە شوو. *(رخزادی. ٤٠١)* **ف** [این سخن پیردختری است که دلش را به ثروت پدرش خوش کرده که او را شوهر بدهد].

**وەنە سەگ و سەرگوێلك:** بە دوو کەسی بێ‌نرخ ئەوترێ کە هەمیشە پێکەوە بن. *(رخزادی. ٤٠١)* **ف**[به دو نفر بی‌ارزش و ناباب گفته می‌شود که همیشه با هم باشند].

**وەنە سیر و مار:** خۆشیان لەیەك نایە. *(رخزادی. ٤٠١)* **ف** [همدیگر را دوست ندارند].

**وەنە کارد و پەنێر:** واتە ئەو دوو کەسە زۆر بەینیان ناخۆشە. *(رخزادی. ٤٠١)* **ف** [به دو نفر گفته می‌شود که میانه‌شان خوب نباشد].

**وەیتە کەو خۆخوەر، نەدەیتە کوشت نەفەر نەفەر:** دوژمنی میللەت و هاوزمانی خۆتی. **ف** [با تک‌تک افراد هم‌زبان خود سر دشمنی داری].

